# قورئانی پیرۆز

# له

# ١٠٠

# فەرمودەی پێغەمبەردا



صلى الله عليه وسلم



د. محمد زكى محمد خضر
وەرگێڕانی : صاڵح سەعید



٢٠٠٧

د. محمد زكى محمد خضرد

وەرگێڕانی: صالح سەعید

# قورئانی پیرۆز لە

# (١٠٠) فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشەکی:

سوپاس و ستایش بۆ خـوای گـەورە، درودو ڕەحمـەت بۆسـەر گیـانی پاکی پێغەمبەری ئازیزو یاران و شوێنکەوتووانی تارۆژی دوایی.
ڕاستترین وتە قورئانەکەی خوایە، دروست و دوورە لـە لـەکەو کەم وکورتی، ئەو قورئانەی کەهەندێك نەتەوە بەرێزو بلند دەکات و هەندێکی‌تر شکستەو داتەپیو، ئەوانەی دەستی پێوە دەگرن و پەیڕەوی دەکەن، سەربەرزو ڕوو سووری دونیـاو قیامەتن، بەلام ئەوانەی فەرامۆشی دەکەن و پشتگوێی دەخەن، ڕەنـج بەخەسـارو بەدبەختن. نەتەوەی موسلمان هەرکات دەستی توند پێـوە گرتبـێ، مامۆسـتای مرۆڤایەتی بووە، بەلام کاتێ پشتی تێ کـردو هیجـری کـرد بـووە دواکەوتـەو، بەردەوام چاوی لـەدەستی خەلکانی ترو نەیارانی ئایینەکەیـەتی . بۆئـەوەی ڕێـزو پایەداری بۆخۆمان بگێڕینەوەو جارێکی تر پێشەوایەتی‌و مامۆستایەتی مرۆڤایەتیمان دەست بکەوێتەوە بادەست بەقورئانەوە بگـرین و بیکەینـە بـەهاری دلـەکانمان و هەروەك چۆن گەشتی بەهارانـە بـەخۆمان و منـالْ و کـەس وکارمـان دەکـەین، باگەشتی بەردەوامیشیان هەبێت بۆ گولزاری قورئان و دلەکانمانی پێ ئاوبدەین.
زۆر دلخۆش بووم کە کتێبێکم بینی بەناوی (هذا القران في مائة حديث نبوي) بووە خولیای سەرم کەبەپشتیوانی خوا وەریبگێڕمـە سـەر زمـانی شـیرینی کوردی بەئومێدی ڕەزامەندی خوای گەورە و پاشان سوودی خوێنەری بـەڕێزی کورد. هیوادارم بتوانم بەم هەولە کەمە خزمەتێك بە قورئانی پیرۆزو نەوەی نـوێ بکەم (والله من وراء القصد) .

وەرگێڕ

# پێشەکی دانەر

سوپاس بۆ خوای جیهانیان، باشترین سڵاوو ڕێز بۆ سەر گەورەمان محمد(ﷺ) و کەسوکارو هاوەڵانی بەگشتی.

ڕاستترین وتە کتێبی خوایە، کە وتەی جیاکەرەوەیەو گاڵتەجاڕی تیانییە، بەڵام زۆربەی موسڵمانان پشتگوێیان خستووە، کەمترین هەوڵێك بۆگەڕانەوەو گەیشتنەوە بەکاروانی عاشقانی قورئان بیرخستنەوەیە، کەبەسوودە بۆ باوەڕداران. لەم کتێبەدا سەد فەرموودەی پێغەمبەری تیادایە (ﷺ) ، دابەش کراوە بەسەر نۆ دەروازەدا:

دەروازەی یەکەم : هەشت فەرموودەی لەخۆگرتووە دەربارەی قورئان خوێندنو پلەوپایەی قورئان خوێنان لەدونیاو دواڕۆژدا .

دەروازەی دووەم : نۆ فەرموودە سەبارەت بەفێربوونی قورئان .

دەروازەی سێیەم : هەشت فەرموودە دەربارەی لەبەرکردن وخۆپاراستن لە لەبیرچوونەوەی قورئان و پلەوپایەی ئەوانەی لەبەری دەکەن .

دەروازەی چوارەم : کاکڵی ئەم کتێبە لەچوارەمدایە کە کارکردنە بەقورئان و ڕاسپاردەو فەرمانی خواو پێغەمبەرەکەیەتی .

دەروازەی پێنجەم : دوانزە فەرموودە لەخۆ دەگرێت دەربارەی چۆنێتی خوێندنەوەی قورئان و گرنگی پێدانی بەجوان خوێندنەوە (تجوید) و بێدەنگ بوون (خشوع) لەکاتی گوێ لێگرتنیدا .

دەروازەی شەشەم : هەشت فەرموودە دەربارەی ویردە قورئانیەکان خەتم و دابەشکردنی بۆ چەند حیزبێك و نزا لەکاتی خەتم کردنی، بەو شێوەیەی لە پێغەمبەرەوە دەگێڕدرێتەوە، وەباشترین تیلاوەی قورئان لە نوێژدایە.

له فـهرموودهی (٦٠ – ٧٠ ) ئـهوهی کـه هـاتووه دهربـارهی قورئـان خوێندنی پێغهمبهر(ﷺ) لـهپێنج فـهرزو سـوننهت و نهوافلـهکان و سـوجدهکانی تـیلاوهدا. وهچـهند سـورهتێکی قورئـانی تایبـهت کـردووه بـهڕێزی تایبـهت، لـهوسورهتانه ( الفاتحة، البقرة، آل عمران، یس، دخان، الواقعة، الاسراء، الزمـر، الملك، الزلزلة، الاخلاص، المعوزتین، الکافرون ) وهلـه ئایهتهکان (ایات الکرسی ، کۆتایی سورهتی البقرة، کۆتایی سورهتی الحشر ) ئهو سـورهتو ئایهتانـه بابـهتی بهشی ههشتهمه که (٢١) فـهرمووده لـهخۆدهگرێت. بهشـی کۆتـایی لهههشـت فهرمووده پێکهاتووه کهدوعا بهقورئان بکرێو کرێی لهسهر وهربگیرێ .

ئهم کتێبه لێکدانهوهو شـیکردنهوهی فـهرموودهکان نیـه بـهو ڕادهیـهی کهتهنها ڕیزکردنی ئهوفهرموودانهو ههڵوێسته کردنه لهسهریان .

ههرکـهس دهیـهوێت زیـاتری دهسـتبکهوێت، دهتوانێـت بگهڕێتـهوه بۆکتێبهکانی فهرموودهو لێکدانهوهکان و تهفسیرهکان. ئـهم کتێبـه ئهگـهر تـهنها ئهوهنـده ئـهنجام بـدات کـه سـهرنجهکان ڕاکێشـێ بـهلای گرنگـیو گـهورهیی خوێندنهوهو دهورکردنهوهی قورئان و فێربوون و لهبهرکردن و کارکردن پێـی، تهواوکارێکی گهورهی ئهنجامداوه، ههرکهس وادهزانێـت مـافی قورئـانی نـهداوه بهوشێوهیهی خوا فهرمانی پێداوه، بابڕیار بدات تهوبه بکات و بگهڕێتهوه بـۆلای پهروهردگاریو ههوڵی بهدهست هێنانی ڕهزامهنـدی خـوا بـدات، ئهگـهر بهنـده نیهتی بۆ خوا بێت و مهبهستی خوا بێت، خوا گهرمتر دهچێت بهدهمیهوه.

فهرموودهکانی تایبهت به (فضـل) و گـهورهیی قورئـان و لێکدانـهوهی سهدان فهرموودهیه، ئهوهی لێرهدا هێنـراوه دیارترینیانـه، ئێمـه نهچـوینهته سـهر تهفسیری تهواوی فهرموودهکان، چـونکه نوسـراوی تایبـهت بـهو بـواره ههیـه، زۆربهی فهرموودهکان (صحیح)ن کهمێکیان ههندێك لهزانایان بهلاوازیان دهدهنه

قەڵم ئەوانیش باسی ( فضائل الاعمال) پلـەو پایـەی کـردەوەی بـاش دەکـات، هەرچی فەرموودەیەکیش لەو بابەتە بێت با لاوازیش بێت کاری پێ دەکرێت .

ئەم نوسراوە لەکەم و کـورتی بـەدەر نیـە، حـاڵی وەکوحـاڵی هـەموو کارێکی مرۆڤ، بەڵام تەنها پەرتوکەکەی خوایە کە دوورە لە لەکەو کەم وکورتی و هەڵە، هەرکەس سوودی لەم نووسراوە بینـی سوپاسـی خـوا بکـات و داوای قبوڵ بکات، وە هەرکەس جگە لەوەی بینی با داوای لێبوردنی خوایی بکـات و کەم و کورتی یەکان پڕ بکاتەوە .

**دانەر**

# دەروازەی یەکەم

## پاداشت و پلەوپایەی خوێندنەوەی قورئان

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ إِذَا ذُكِرَ اللّهُ وَجِلَتْ قُلُوبُهُمْ وَإِذَا تُلِيَتْ عَلَيْهِمْ آيَاتُهُ زَادَتْهُمْ إِيمَاناً وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ﴾ (الانفال/٢) خوێندنەوەو دەورکردنەوەی قورئان باوەڕی باوەڕداران بەهێز دەکات.

١ – لە عەبدولای کوڕی عەباسەوە( ﷺ) دەفەرموێت:(( پیاوێك وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، چ کارێك زۆر خۆشەویستە لای خوا، فەرمووی:( الحال المرتحل) وتی:(الحال المرتحل) چیە؟ فەرمووی: ئەوکەسەیە لە سەرەتای قورئانەوە دەست پێدەکاتەوە، هەرکاتێك خەتمێکی تەواو کرد لە سەرەتاوە دەست پێدەکاتەوە)) ترمذی ڕیوایەتی کردووە.

لەو فەرموودەیەدا پێغەمبەر(ﷺ) جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کەسێك سەرگەرمبێت بەتیلاوەو خوێندنەوەی قورئان، جارلە دوای جار هەڵەکان بقۆزێتەوە. هەروەها ئاماژە بەگەورەیی پاداشتی دیاری کردنی وردی ڕۆژانە لەقورئان دەکات، (حال المرتحل) بریتیە لەوەی کەسێك خەتمی قورئان تەواو دەکات ڕاستەوخۆ پاش خوێندنی نزای خەتم دەگەڕێتەوە سەرخوێندنەوەی سورەتی (الفاتحة) و پێنج ئایەت لە سورەتی (البقرة).

چەندین فەرموودە هەیە ئاماژە بەباشترین کردەوەکان دەکات وەك: ((افضل الاعمال الى الله ادومها وان قل)) ئەم فەرموودەیە گشتیە، واتای

ئەوەیە: باشترینی کردەوەکانی لای خوا بەردەوامەکانە ئەگەرچی کەمیش بێت. بەلام فەرموودەی (الحال المرتحل) فەزلی بەردەوامبوونی خوێندنەوەی قورئان دیاری دەکات.

٢ –(( عن عبدالله بن مسعود(ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال:"من قرأ حرفاً من كتاب الله فله به حسنة، والحسنة بعشر أمثالها، لا أقول الم حرف ولكن الف حرف و لام حرف و ميم حرف)) (رواه الترمذي).

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی مەسعود(ﷺ) ڕیوایەت کراوە کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەسێك پیتێك لە قورئان بخوێنێت، چاکەیەکی بۆ هەیە، چاکەش یەك بە دەیە، من نالێم (الم) پیتێکە، بەڵکو(أ) پیتێکەو (ل) پیتێکەو (م) پیتێکە. چەندجار بوونی چاکە، یەك بە دە، ڕاستیەکی قورئانیە کە خوا دەفەرموێت:﴿ مَن جَاء بِالْحَسَنَةِ فَلَهُ عَشْرُ أَمْثَالِهَا وَمَن جَاء بِالسَّيِّئَةِ فَلاَ يُجْزَى إِلاَّ مِثْلَهَا وَهُمْ لاَ يُظْلَمُونَ﴾ (الأنعام/١٦٠) واتە: هەرکەس چاکەیەك ئەنجام بدات یەك بە دە پاداشتی هەیە وە هەرکەس خراپەیەکی ئەنجامدا تەنها تۆڵەی ئەوەی لێ دەسەنرێتەوە وە ئەوان ستەمیان لێ ناکرێت.

هەندێك لە زانایان وتویانە: هەر پیتێك لە پیتەکانی قورئان زیاتر لەچەند مانایەکی لەخۆ گرتووە و هەرکەس بەپێی زانست و زانیاری سوودی لێ دەبینێت.

٣ - (( عن أبي امامة( ﷺ)قال: قال رسول الله(ﷺ ): ما اذن الله لعبد من شيء افضل من ركعتين يصليهما وان البر ليذر على رأس العبد مادام في صلاته و ماتقرب العباد الى الله بمثل ما خرج منه يعني القران)) (رواه الترمذي).

واتە: لەباوکی ئومامەوە(ﷺ)وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: هیچ شتێك نیە کەخوا ڕێگەی دابێت بە بەندەکەی ئەنجامی بدات باشتربێت لە

دوو رکات نوێژ ئەنجامی بدات، وەخێرو چاکە لەسەرسەری بەندەوە دەردەچێت هەتا لە نوێژدابێت و هیچ شتێك بەندەکان نزیك ناکاتەوە لەخوا بەرادەی ئەوەی لێی دەردەچێت، واتە قورئان.

ئاماژەی ئەو فەرموودەیە بۆئەوەیە کە قورئانی پیرۆز لای خوای گەورەوە هاتووە بۆیە پێویستە قورئانخوێن گەورەیی وتەی خوا لە دڵی خۆیدا بچەسپێنێت، دەبێت وابزانێت کە خوا ڕاستەوخۆ گوێبیستی بەندەکەیەتی.

هەندێك لە زانایان وتوویانە: ئەو قورئانە پەیامی خوایە بۆمان هاتووە لە نوێژەکانماندا دەیخوێنینەوەو سەرنجی لێ دەگرین و هاوەڵێتی دەکەین و لە وردەکاریەکانی ژیانماندا جێ بەجێی دەکەین.

٤- عن أبي موسى(ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال: مثل المؤمن الذي يقرأ القرآن مثل الاترجة ريحها طيب وطعمها طيب ومثل المؤمن الذي لايقرأ القرآن مثل التمرة لاريح لها وطعمها حلو. ومثل المنافق الذي يقرأ القرآن مثل الريحانة ريحها طيب وطعمها مر، ومثل المنافق الذي لا يقرأ القران مثل الحنظة لاريح لها وطعمها مر)) ( رواه الخمسة) .

واتە: لە ئەبی موساوە(ﷺ) گێڕاویەتیەوە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: نموونەی باوەڕداری قورئانخوێن وەکو (پرتەقاڵ یان لالەنگی) وایە، بۆنیشی خۆشەو تامیشی خۆشە، نموونەی باوەڕدارێك قورئان ناخوێنێ وەکو خورما وایە، بۆنی نیەو تامی شیرینە، نموونەی دووڕوویەك کە قورئان دەخوێنێت وەکو ڕیحانە وایە، بۆنی خۆشەو تامی تاڵە، وەئەو دووڕووەی قورئان ناخوێنێتەوە وەکو( کوژاڵك) وایە، بۆنی نیەو تامیشی تاڵە.

لەم فەرموودەیەدا دوو جۆر لەیەکچواندن هەیە: یەکەم بە بۆنی خۆش، دووەم بەتامی خۆش، بۆنی خۆش بڵاو دەبێتەوە بۆ دەورووبەر، بە مانای ئەوەی

خوێنەری قورئان باوەڕدار بێت یان مونافق سوودی دەبێت بۆکەسانی تر لەوانەی گوێبیستی خوێندنی قورئانەکە دەبن، تەنها سوودی بۆ کەسی قورئان خوێن نییە بەڵکو بۆ کەسانی تر بەوەی فێری قورئان خوێندنیان بکات یان ئاگاداری حەرام و حەلاڵی قورئانی بکات.

بەڵام تامی خۆش کەسەکە خۆی هەستی پێ دەکات، کەسانی تر هەستی پێ ناکەن، هەروەك ئیمان وەکو خواردنێکی خۆش وایە تەنها ئەو کەسەی دەیخوات هەست بەتام و خۆشی دەکات، هەڵگری ئیمانیش کە فەرمانەکانی بەجێ دەهێنێ خۆی دوورە پارێز دەگرێت لەقەدەغە کراوەکان و پابەندی فەرمانەکانی دەبێت.

٥- عن اسید بن حضیر(ﷺ) قال: بینما هو یقرأ من اللیل سورة البقرة و فرسه مربوطة عنده اذ جالت الفرس، فسکت فسکنت، فقرأ فجالت الفرس فسکت وسکنت الفرس ثم قرأ فجالت الفرس فانصرف وکان ابنه یحی قریباً منها فاشفق أن تصیبه فلما اجتره رفع رأسه الی السماء حتی ما یراها فلما أصبح حدث النبي(ﷺ) فقال له: اقرأ یا ابن حضیر، اقرأ یا ابن حضیر: قال فاشفقت یارسول الله أن تطأ یحیی وکان منها قریباً فرفعت رأسي فانصرفت الیه فرفعت رأسي الی السماء فاذا مثل الظلة فیها أمثال المصابیح فخرجت حتی لا أراها قال وتدري ماذاك قلت لا قال: تلك الملائکة دنت لصوتك ولو قرأت لاصبحت ینظر الناس الیها لاتتوازی.(رواه البخاري).

واتە: لە ئوسەید کوڕی حوضەیر(ﷺ) وتویەتی: لەکاتێکدا شەو سورەتی(البقرة)م دەخوێندەوە، ماینەکەم لەولامەوە بەسترابووەوە، خرۆشا، بێ دەنگ بووم ئارام بووەوە، خوێندم خرۆشایەوە، بێ دەنگ بووم ئارام بووەوە، پاشان خوێندمەوە، خرۆشایەوە و هەڵدەبەزییەوە، دەستی هەڵگرت لە قورئان

خویندنەکە، (یحی)ی کوڕی لەولاوە لە نزیك ماینەکەوە بوو ترسا لەوەی لەقەیەکی لێ بدات یان بکەویتە ژێر پێی، پاش ئەوەی هەڵی گرت سەری بەرز کردەوە بۆ ئاسمان بزانێ چی هەیە. بەیانییەکەی ڕوداوەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێرایەوە، ئەویش فەرمووی: بخوێنە ئەی کوڕی حەضیر بخوێنە ئەی کوڕی حضیر، ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا ترسام(یحی) ژێرپێ بخات، چونکە نزیك بوو لێی، سەرم بەرز کردەوە کاتێ چووم بەدەمیەوە بینیم ڕوناکییەك وەکو کۆمەڵە گڵۆپێك داگیرسابێت چوومە دەرەوە تابیبینم. فەرمووی دەزانیت ئەوە چی بوو؟ ووتم نا، فەرمووی: ئەوە فریشتە بوون دابەزیبوون بۆ بیستنی دەنگی قورئان خوێندنەکەت، ئەگەر بەردەوام بویتایە لە قورئان خوێندنەکە تا بەیانی خەڵکی فریشتەکانی دەبینی و وون نەدەبوون لەچاویان.

خوای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ﴾ (الحشر ٢١)
کاریگەری قورئان تەنها لەسەر مرۆڤەکان نییە بەڵکو لەسەر دارو بەردو کەژو کێو و دەریاکانیشە، هەمووان تەنانەت ئاژەڵکانیش، هەمووان دەکەونە ژێر کاریگەری قورئانەوە. بەلام ئێمە هەستی پێ ناکەین مەگەر پیاوچاکان و نزیکان لە خوای گەورە، وەکو(اسید) ئەوانیش هەرگیز خۆیانی پێ هەڵناکێشن، بەڵکو دەیشارنەوە، ئەگەر دەریش کەوت سوپاسی خوا دەکەن و دوعا دەکەن کەنەبێتە مایەی (استدراج الشیطان) بۆیان.

جیاوازی نێوان(استدراج) و (کرامات) ئەوەیە، کەرامات لەسەر دەستی بەندەیەکی چاکی پابەند بە یاساکانی قورئان و سونەتەکانی پێغەمبەرەوە(ﷺ) دەردەکەوێت، بەلام ئستیدراج ئەوەیە کە هەندێك شتی بەدەر لە عادات دەردەکەوێت لەسەر دەستی کەسێك هیچی بۆ زیاد ناکات جگە لە دووری لە

یاساکانی قورئانەکەی خواو سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) وە لەم بارەوە هەندێك پیاوچاك فەرموویانە: ئەگەر بینیت کەسێك بەهەوادا دەفڕێت، یان بەسەر ئاودا دەڕوات بەلاّم پێچەوانەی سوننەتێك لە سوننەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) هەڵس وکەوت دەکات ئەوە بزانە کە ئەوە لەشەیتانەوەیە.

٦- عن سمرة بن جندب(رضي الله عنه) عن النّبي (ﷺ) قال: كل مؤدب يحب أن يؤتى مأدبته، ومأدبة الله القرآن فلاتهجروه.(رواه البيهقي)

واتە: هەموو خاوەن خوانێك حەزدەکات کەسانێك لە چوار دەوری خوانەکەی کۆببنەوە، خوانی خوا قورئانی پیرۆزە پشتی تێ مەکەن.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئاماژە بە سکالاّی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات کەلای خوا شکایەت دەکات لەکەسانێك لە ئوممەتەکەی کە هەجری قورئانیان کردووە و پشتیان تێ کردووە، هەروەك دەفەرموێت:﴿ وَقَالَ الرَّسُولُ يَا رَبِّ إِنَّ قَوْمِي اتَّخَذُوا هَذَا الْقُرْآنَ مَهْجُوراً﴾ (الفرقان/ ٣٠) . ئەوەی لە فەرموودەکەدا هاتووە باسی سفرەو خوانە کە خۆراکی جەستەی مرۆڤی لەسەرە، بەلاّم خوانی قورئانی خۆراکی دەروون و گیانی تێدایە، وەخوای گەورە قورئانی بۆ ڕێنمایی کردنی بەندەکان ناردووە﴿الم* ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ (البقرة/١-٢).

کەواتە قورئانی پیرۆز بەمەبەستی ڕێنمایی و تێرکردنی گیان و دەروونی بەندەکان هاتووە، لەبەر ئەوە پێویستە بەدەم ئەو بانگەوازە خواییەوە بچین ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ اسْتَجِيبُواْ لِلّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُم لِمَا يُحْيِيكُمْ﴾ وەپشت تێکردنی واتە پشت کردن لەزیکرو یادی خوا، کە ئەوە کارێکی زۆر خراپە، ئەوەی لە سورەتی ((الفرقان)) دا هاتووە باس لە هیجران و پشت هەڵکردنی کافران دەکات لە ئیمان و ئیسلام و ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز، بەلاّم هیجرانو

پشت هەڵکردن لە تیلاوە و خوێندنەوەی قورئان ئەوەیە کە لەفەرمودەکەدا هاتووە، پێشەوا ((ئەبو حەنیفە)) سنووری هیجرانی قورئانی لەتیلاوەدا وا داناوە کەپێویستە لەساڵێکدا لەدووجار کەمتر خەتمی نەکرێت.

هەروەها زانایانی تر بە خراپیان داناوە کە قورئان لە ماڵدا یان لە هەر شوێنێکدا دابنرێت بەبێ خوێندنەوەو دەورکردنەوە.

٧- عن أنس بن مالك(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ): ان لله اهلين من الناس، قيل من هم يا رسول الله(ﷺ) ، قال: اهل القرآن اهل الله و خاصته. (رواه الامام أحمد و ابن ماجة و أبوالقاسم بن حيدر في مشيخته عن الامام و صححه)

واتە: لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ﷺ) ووتی: پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: بۆخوای گەورە هەیە کەسانێکی تایبەت لە خەڵك، وترا ئەوانە کێن ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)فەرمووی: هاوەڵانی قورئانن، کەسانێکی نزیك و تایبەتن لای خوا.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ* اللَّهُ الصَّمَدُ* لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ* وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾ واتە: ئەی موحەممەد بڵێ خوا تاك و تەنهایە، خوا جێگەی نیازی بەندەکانیەتی بێ نیازە لە بەندەکانی، کەسی لێ نەبووەو لەکەسیش نەبووە، وە هەرگیز هاوشێوەی نییە.

بێگومان خوای گەورە پاکو بێگەردەو دوورە لەوەی هاوەڵ یا منداڵی بێت وە جولەکەکان درۆیان کرد کاتێك وتیان ئێمە رۆڵەی خواین و خۆشەویستی خواین، بەڵام بەندەی ڕاستگۆ ئەوەیە کە خوای خۆی خۆش دەوێت پێویستە لە میانەی خۆشویستنی قورئانی پیرۆزەوە دەری ببڕێت.

هەر کەس قورئانی خۆش بوێت شەوانەو ڕۆژانە دەوری دەکاتەوە و هاوەڵ و هاودەمیەتی بەوەش خوای گەورە بە بەخششی خۆی بەرزی دەکاتەوە

بۆئەوەی ببێتە کەســە تایبەتـەکان و بەنـدە چـاکەکانی و خواپێـداوان لــە نێـوان تەواوی بەندەکان و ئەوانەی خوایان لێ ڕازی بووەو لەخوا ڕازی بوون، خـوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُـمْ ذُنُوبَكُمْ﴾(آل‌عمران/ ٣١) .

لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودەوە(ﷺ) فەرموویەتی: بەنـدەی خوانـاس هیچ لە خۆی نەپرسێت حگە لە قورئان، ئەگەر قورئانی خۆش بوێت ئەوا خـواو پێغەمبەری خۆش دەوێـت، وە هەرکـەس خـواو پێغەمبـەری خـۆش بوێـت ئـەوا لەڕۆژی قیامەتدا خوای گەورە لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) حەشری دەکات، چـونکە پێغەمبەر فەرموویەتی: (( يحشر المرء مع من أحب)) واتە: مرۆڤ لەگەڵ کەسێکدا حەشر دەکرێت کە خۆشیدەوێت. بە عەبدوڵڵای کوڕی مەسـعودیان ووت: تـۆ ڕۆژووی سوننەت کەم دەگریت، فەرمووی: ئەگەر بـەڕۆژووبم کـەم توانـا دەبم لەقورئان خوێندندا، قورئان خوێندنەکەم بەلاوە خۆشترە لە ڕۆژوو گرتنەکە.

هەروەها مالکی کوڕی دینار کە یەکێك بـووە لــە تـابعین (ڕەحمـەتی لێ بێت):دەفەرمووێت: قورئان چی لە دڵتانا چاندووە ئەی ئەهلی قورئان؟ چـونکە قورئان بەهارو ژیانی دڵەکانە هەروەك چۆن باران بەهارو ژیانی زەوییە.

٨- عن أبي امامة(ﷺ) عن النَبي (ﷺ ) قال: "اقرأوا القران فانه يجـيء يوم القيامة شفيعا لصاحبه". (رواه مسلم)

واتە: لە باوکی ئومامەوە(ﷺ) لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: قورئـان بخوێنن چونکە لە ڕۆژی دواییدا دەبێتە تکاکار بۆ هاوەڵکەی.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْـدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِـهِ﴾ واتـە کێ یە لای خوا تکاکارە جگە لەوە نەبێ کە ڕێگەی پێ دەدرێت.

قورئانی پیرۆز تکاکاری تکا وەرگیراوە بەئیزنی خوا. شەفاعەت و تکاکاری بریتییە لە داوا کردن لە خوای گەورە لەلایەن تکا کارەوە کەخۆش بێت لە گوناهو کەم و کورتیەکانی تکا بۆ کراو، پلەو پایەی بەرز بکاتەوە، بیخاتە بەهەشت و لەئاگر بیپارێزێت. چەند جوانە و پلەیەکی بەرزە کە قورئان تکا بۆ خوێنەرەکەی بکات لەرۆژی دواییدا وەکو یاداشتێك لەبەرامبەر خزمەتکاری و گرنگی دان بە قورئان لەدنیادا بەڵکو لەوەش زیاتر خوێنەری قورئان پلەی بەرز دەبێتەوە تائەو کاتەی شەفاعەت و تکاکاری بریتی نییە لەواسیتە کردن بەڵکو بەمانەی خوارەوە پێناسە دەکرێت:

أ-تکاکار مۆڵەت لەخوا وەردەگرێت بۆ تکا کردنەکە، هیچ کەس بۆی نییە تکا بکات مەگەر داوای مۆڵەت بکات یان خوا خۆی مۆڵەتی بدات.

ب- شەفاعەت ناکرێ و بەدەست نایە تا تکا بۆکراو هۆکاری شایستەی ئەو تکا بۆ کردنەی دەست نەکەوێت.

ج-تکاکردن زیادەیە کە لە سەلماندنی رەحمەتی خوا، هۆکارێك نیە بۆ جیاکردنەوەی هەندێك کەس کە دادپەروەری خوا بیانگرێتەوە.

ء - تکاکار نەپەرستراوێکە جگە لە خوا، نە هاوەڵی خوایە، هیچ زیان و قازانجێکی بەدەست نییە نەبۆ خۆی نە بۆ کەسانی تر. دەکرێت دروستکراوێك بێت یان کەلامی خوابێت کە قورئانە یان کارێکی چاکی بەندەیە وەکو رۆژوو. دەکرێت تکاکار پلەو پایەیەکی تایبەتی لای خوا هەبێت کە شایستەی ئەو تکاکردنە بێت.



# دەروازەی دووەم
## فێربوون و فێرکردنی قورئان

٩- عن عثمان بن عفان(رضي الله عنه) عن النَّبي (ﷺ) قال: خيركم من تعلم القرآن و علمه. (رواه البخاري و أبوداود و ترمذي) واته: باشترینتان ئەوەتانە کە قورئان فێردەبێت و کەسانی تر فێردەکات.

ئەم فەرموودەیە پشتگیری چەند فەرموودەی تر دەکات لەوانە: ((العلماء امناء الله على خلقه)) واتە: زاناکان ئەمینداری خوان لەسەر دروستکراوەکانی. ئەو زانایەی قورئان فێردەبێت و کەسانی تریش فێردەکات، بۆتە جێنشینی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەیاندن و فێرکردنی قورئان. بەڵکو بۆتە جێنشینی خوا لەگەیاندنی فەرمانەکانی خوا بە بەندەکان، کە بەم کارەی دەستی خەڵکی دەگرێت بۆ خێرو چاکەی دنیاو دوارۆژ. شایستەی ئەوەیە کە باشترینی بەندەکانی خوابێت کە بەسوودترینیانە بۆ بەندەکان.

فێربوون و فێرکردنی قورئان پێویستە تەنها مەبەست بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوابێت. وە پێویستە مامۆستای فێرکردنی قورئان کاری پێبکات پێش فێرکردنی کەسانی تر بۆ ئەوەی لەوکەسانە نەبێت کە فەرمان بە چاکە دەکەن و خۆیان لەبیر دەچێتەوە﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ﴾(البقرة/٤٤) هەرکەس زانستێك فێرببێت بۆ بەربەرەکانێی سەفیە و گاڵتەجارەکان یان شان شانێن لەگەڵ زاناکان یان بۆشانازی کردن و دەست خستنی پیاهەڵدان و سوپاس و ناوبانگ و ماڵ و سامانی دنیایی، نەوەك هیچی دەست نەکەوتووە، هەموو هەوڵ و کۆششی بەزایە چووەو لەزیانمەندانی ڕۆژی دواییە. بەڵام هەرکەس

مەبەستی خوا بێت و کار بە زانستەکەی بکات و کەسانی تریش فێربکات و قورئان بخوێنێت بۆ نزیکبوونەوە لە خوا ئەوە بەنیازی پاداشتی خوایەو پاداشتی چاکیش لای خوایە.

هاندانی ئەم فەرموودەیە بۆ فێربوون و فێرکردنی قورئان پاڵپشتی بەهێزە بۆ فەرموودەیەکی تر کە پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: (( بلغوا عني ولو آية))

واتە: لەجیاتی من بیگەیەنن ئەگەر یەك ئایەتیش بێت. هەرکەس یەك ئایەت باش فێربوو، پێویستە لەسەری بیگەیەنێت و کەسانی تر فێر بکات. نابێت تەمەڵی تیا بکات بە بیانووی جۆراو جۆرەوە، یان بەکارێکی بچوك و کەمی بزانێت. چونکە کاری چاکە هەرچەند کەم بێت لای خوا زۆر گەورەیە.

١٠- عن عبدالله بن عمرو (رضي الله عنهما) عن النَبْي (ﷺ) قال: يقال لصاحب القرآن اقرأ وارتق ورتِّل كما كنت ترتل في الدنيا فان منزلتك عند آخر آية تقرأوها)

واتە: بەقورئانخوێن دەوترێت: بخوێنە و بەرزبەرەوە، هەروەك چۆن لەدونیا لەخزمەت قورئاندا بویت و دەتخوێندەوە، چونکە پلەوپایەی تۆ لەگەڵ کۆتا ئایەتە کە دەیخوێنیت

باوەڕداران لەسایەی ووشەی شایەتوومان کە هیچ خوایەك نییە جگە لە((ألله)) وە((محمد)) نێردراوو پێغەمبەری خوایە، دەچنە بەهەشتەوە بەڵام پلەوپایەو شوێنیان بەپێی لێبڕان و ماندوێتی و سەرقاڵ بوون و هەوڵدان جیاوازە.یەکێ لەو کاروکردەوانەی کە شوێن و پلەوپایەی باوەڕدار دیاری دەکات و بەرزوبڵندی دەکات بریتییە لەخوێندن و لەبەرکردن و خزمەتکردنی قورئانی پیرۆز هەرکەس زیاتر لەخزمەتی قورئاندابێت پلەوپایەی بەرزترە. ئەم

فەرموودەیە جەخت لەسەر چاك خوێندنەوەو بەتەجویدەوە خوێندنی قورئان دەكاتەوە.

**١١– عن عقبة بن عامر(ﷺ) قال: خرج علينا رسول الله(ﷺ) ونحن في الصفة فقال: أيكم يحب أن يغدو كل يوم بطحان أو العقيق فياتي بناقتين كوماوين ل غد اثم بالله ولا قطع رحم فقلنا يارسول الله كلنا نحب ذلك فقال: فلئن يغدو احدكم كل يوم الى المسجد فيتعلم آيتين من كتاب الله عزوجل خير له من ناقتين وثلاث خير له من ثلاث و اربع خير له من اربع ومن اعدادهن من الابل. ( رواه مسلم وابوداود)**

واته: كێ لە ئێوە حەزدەكات هەموو ڕۆژێك بڕوات بۆ(بطحان) یان( عقیق) دوو وشتری قەڵەوی پشت بەرز بهێنێت دوور لە گوناهو بچڕاندنی سیلەی ڕەحم، ووتمان هەموومان حەز بەوە دەكەین ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: هەركەس لەئێوە ئەگەر ڕۆژانە بچێت بۆ مزگەوت و دوو ئایەت لە قورئان فێرببێت چاكترە بۆی لە دوو وشتر، سیان لە سیان چاكترە و چوار لە چوار چاكترە، بەژمارەی فێربوونی ئایەتەكان لە بەرامبەریاندا لە ژمارەی وشترەكان چاكترە.

(اهل الصفة) هەژارترینی خەڵكی مەدینە بوون كە لە مزگەوت نیشتەجێ بوون ئەو نموونەیەی كە پێغەمبەر(ﷺ) هێنایەوە كە فێربوونی هەر ئایەتێك لە قورئان باشترە لە دەستخستنی وشترێك كە بۆ ئەو ڕۆژە دەستكەوتێكی گەورە بوو، لەوانەیە لەبەرامبەر نرخی ئۆتۆمبیلێكی ئەمڕۆ بوەستێتەوە. هاندانی باوەڕدارانە لەسەر فێربوونی قورئان كە چەندین جار پلەی بەرزترە لە دەستكەوتە دونیاییەكان.

بێگومـان بەدەسـتهێنانی ڕۆزی حـەلاڵ و خـۆ بـەدوورگرتن لەدەسـت پانکردنەوە لـە خەڵکی و بژێوی ژیان بۆ خـۆت و مـاڵ و منـداڵت کـە ئـەویش پێویستەو فەرمانـەو پەرستشـە کـە بریتییـە لـەهۆی بـەردەوامی ژیـان. بەهـەمان شێوەفێربوونی بنەماکانی ئیسلام و شارەزابوون لـە قورئان کە کەتـەلۆکی ژیـانی دونیاو دوارۆژە لـە تەواوکاریەکانی جوانکردنی ژیانی موسڵمانانە.

لێرەوە دەتوانین بڵێین پێویستە هەموو بوارەکانی ژیـان بـەڕادەی خـۆی گرنگی پێبدەین وە نابێت هیچ کام لەسەر حسابی ئـەوانی تـر بێـت، زانسـت و زانیاری پلەوپایەی تایبەتی هەیە لای خوای گەورە.

**١٢** – عن أبي هريرة(ﷺ) عـن النَّبْـي (ﷺ) قـال: ومـن سـلك طريقـاً يلتمس فيه علما سهّل الله له طريقاً الى الجنة وما اجتمع قوم في بيت من بيوت الله يتلون كتاب الله ويتدارسونه بينهم الا نزلت عليهم السـكينة وغشـيتهم الرحمـة و حفتهم الملائكة و ذكرهم الله فيمن عنده. (رواه مسلم و أبوداود)

واتە: هەرکەسێك ڕێگایەك بگرێت بۆ فێربوونی زانستێك خوای گەورە ڕێگەی گەیشتن بە بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات. هـەر کۆمـەڵێك لـە ماڵێـك لـە ماڵەکانی خوا کۆببنەوە قورئان بخوێننەوەو لـەنێوان خۆیانـدا وانـەی تیـا بڵێنـەوە بێگومـان دڵنـارامی دائەبەزێتـە سـەریان، ڕەحمـەت دایـان دەپۆشـێت، فریشـتە چواردەوریان دەگـرن، خـوا یادیـان دەکاتـەوە لای ئەوانـەی لای خـۆی( واتـە فریشتەکان) .

لـەم فەرموودەیـەدا ئـەوە تێبینـی دەکرێـت کـە پێغەمبـەر(ﷺ) هـانی باوەڕداران دەدات کە لـە دەستخستنی زانستدا چاوەڕێی پاداشتی دوارۆژبن نەك

پاداشی دنیایی. لەگەڵ ئەوەی کە زانست و زانیاری پلەوپایەی دنیایی و سوودێکی مادیشی تیادا دەست دەکەوێت.

بەرزترین و بەنرخترینی ئەو پاداشتانە بریتییە لە یادکردنەوەو خوێندنەوەی خوا بۆ بەندەکانی هەروەك دەفەرموێت: ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ ﴾ (البقرة/ ۱٥۲) واتە: یادم بکەنەوە یادتان دەکەمەوە. چونکە خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز یادکردنەوەی خوایە، خواش یادی کەسێك دەکاتەوە کە یادی دەکاتەوە.

زۆرجار پاداشت و سزا لە ڕەگەزی کارەکەن. هەرکەس ڕێگای ڕاست بگرێتەبەر خوا ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات وە هەرکەس یادی خوا بکاتەوە لە میانەی خوێندنەوەی قورئانەوە، خوا یادی دەکاتەوە. هەرکەس یادی خوا لای کەسانێك بکاتەوە، خوا یادی ئەو دەکاتەوە لای کەسانێکی باشتر لەوان کەفریشتەکانن، وەهەرکەس پشت لە یادی خوا بکات خوا بێباکە لێی.

خوێندن و فێربوونی قورئان و لێکدانەوەی سەرچاوەی بەدەستهێنانی هەموو زانستە شەرعییەکانە ( عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود) فەرموویەتی: هەرکەس داوای زانیاری دەکات بابچێت بۆلای قورئان، چونکە زانستی سەرەتاو کۆتایی تیادایە.

مزگەوتەکان پلەو پایەیەکی بەرزو تایبەتی لای خوا هەیە، چونکە مەلبەندی پەرستش و زانستەکان و یادکردنەوەی خوایە. ئەڵقەکانی فێربوونی قورئان و وەرگرتنی زانستە جۆراوجۆرەکان نەخشەدانان بۆ خەبات و فیداکاری و نەهێشتنی ستەمی ستەمکاران و دابەشکردنی داهاتەکانی زەکات و ڕێکخستنی کاروباری حەج هەمووی لە مزگەوت ئەنجام دەدرا. نوێژی مزگەوت پاداشتی چەندجارەی هەیە، هەروەها پاداشتی مامۆستایان و فێرخوازانی قورئان و کەسانێك کە بۆ یادی خوا دادەنیشن چەند قات و چەندبارەیە.

ئاینی پیرۆزی ئیسلام موسڵمانان هان دەدات کە زانستەکان وەربگرن، لە گرنگترەوە بۆگرنگ دەستپێبکەن، هەموو زانستەکان لـە هـەموو بوارەکـانی ژیاندا لای ئیسلام گرنگ و پێویستین وەکو زانستـەکانی ( پزیشـکی، ئەنـدازە، بیرکـاری، مێـژوو، جوگرافیـا، کۆمبیوتـەرو ئینتـەرنێت و...... هتـد) پێویسـتە هەریەك لەوانە گرنگیان پێبدرێت لـە پاڵ خوێندنی زانستە قورئانییەکان.

**١٣ – عن أبي سعيد الخدري(ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: "يقول الله تعالى: من شغله القران وذكري عن مسألتي أعطيته افضل ما أعُطي السائلين وفضل كلام الله تعالى على سائر الكلام كفضل الله على خلقه".** (رواه الترمذي)

ئەم فەرموودەیە( قدسي) یە واتە دەربڕینەکەی هی پێغەمبـەرەو ماناکـەی هی خوایە. لـەم فەرموودەیـەدا پێغەمبـەر(ﷺ) دەفـەرمووێت خـوا فەرموویـەتی: هەرکـەس خوێندنـەوەی قورئـان و یادکردنـەوەی مـن سـەرقاڵی بکـات داواکاریەکانی لێم بکات، زیـاترو باشـتری لەوکەسـانە پێدەبەخشـم کـە داوام لێدەکەن. وەفەزڵ و گەورەیی قورئان لەسەر هەموو وتەکانی تـر وەکـو فـەزڵی خوا وایە لەسەر بەندەکانی.

بێگومـان فەرموودەکـە مانایـەکی بـەرفراوان لـەخۆ دەگرێـت، ئـەو سەرقاڵییە فێربوون و فێرکردن و جێبەجێ کردن و لەبەرکردن و بانگەواز بـۆی و گەیاندنی فەرمانەکانی و قەدەغە کردنی قەدەغەکراوەکانی دەگرێتەوە.

نـزاو پاڕانـەوە پلەوپایـەی تایبـەتی هەیـە، خـوای گـەورە حـەزدەکات بەندەکانی بانگی لێوە بکەن﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾(غافر/ ٦٠) واتە: بانگم بکەن و داوام لێ بکەن وەڵامتان دەدەمەوە.

**١٤ – عن عبدالله بن عمرو(ﷺ) قال: أتى رجل الى رسول الله(ﷺ) فقال: اقرئني يارسول الله(ﷺ) فانتهى الى قوله تعالى﴿فَمَن يَعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ خَيْراً**

برهٔ * ومن يعْمَلْ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ شَرّاً يَرَهُ﴾ فقال يكفيني وانصرف فقال النبي(ﷺ) :
نصرف الرجل وهو فقيه. (رواه ابوداود والنسائي وابن حبان والحاكم وصححه)

واتە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوا( ﷺ) وتی: قورئانم بەسەردا خوێنەوە ئەی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەریش دەستی کرد بە قورئان خوێندن تا گەیشتە ئایەتی(( فمن يعمل......)) هەرکەس بەرادەی گەردیلەیەك چاکە بکات دەیبینێتەوە، وەهەرکەس بەرادەی گەردیلەیەك خراپە بکات دەیبینێتەوە، پیاوەکە وتی: بەسمە و رۆیشت پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ئەو پیاوە بە فەقیهی و زانایی رۆیشت.

ئەو پیاوە راستگۆو نیە تپاکە لەماوەی چەند خولەکێکدا لە سەرەتای دەست پێکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە قورئان خوێندن بەمەبەستی فێرکردنی کە ئایەتێکی گەورەی بەسەردا خوێندەوە جێی خۆیەتی کە ببێتە بنەمایەکی(اصولي) وە پشتی پیّ ببەسترێت و رێگە رۆشن بکاتەوە. ئەم ئایەتە ماف و ئەرکەکان بۆ مرۆڤ دیاری دەکات، ئەگەر کارێکی چاکی ئەنجامدا هەرچەندە لە گەردیلەیەك بچووکتربێت بەچاکە پاداشتی دەدرێتەوە لەبەرئەوە پێویستە زیادی بکات. وەئەگەر کارێکی خراپ ئەنجام بدات هەرچەندە لەگەردیلەیەك بچوکتربێت تۆڵەی لیّ دەسەندرێت و سزادەدرێت. لەبەرئەوە پێویستە خۆی لیّ بپارێزێت.

ئایا ئەمە کرۆکی زانست و فیقە نییە؟ شایستەی ئەوە بوو پێغەمبەر( ﷺ) بەفەقیە و زانا پێناسەی بکات. لەقورئانی پیرۆزدا ئایەتی زۆر هەیە کە پێویستە هەڵوێستەی لەسەر بکرێت وە دەکرێت بکرێتە قاعیدەی ئسولی و بنەمایەك بۆ جێبەجیّ کردنی لەهەر ساتێکی ژیاندا. موسڵمانێك کە خۆشەویستی قورئان لە دڵیدایە هەمیشە خۆی لە هەڵوێستە کردندا دەبینێتەوە لە خزمەت ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا. بۆنموونە سەیری ئەم ئایەتە بکەو بیخوێنەوەو گوێیان لیّ بگرەو

هەڵوێسته بکه لەسەریان: ﴿ وَما أَصابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ وَيَعْفُو عَن كَثِيرٍ﴾ (شورى/٣٠) ﴿إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ﴾ (حجرات/١٠) ﴿إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَماءُ﴾ (فاطر/٢٨) وَفِي السَّمَاءِ رِزْقُكُمْ وَمَا تُوعَدُونَ﴾ (الذاريات/٢٢).

نموونەی ئەم پیاوە وەکو((حاتەمی ئەصەم))ە کە هاوەڵێتی((شەقیقی بەلْخی)) کرد بۆ ماوەی ٣٠ساڵ تارۆژێك شەقیق پرسیاری لێکردو وتی: تۆ ماوەی سی ساڵە هاوەڵێتی من دەکەیت چی فێربوویت و دەستکەوتت چییە؟

حاتەم وتی: هەشت سوودی زانستیم لێ وەرگرتوویت بەسمە، هیوادارم ڕزگاری خۆمی تیا ببینمەوە.

**سوودی یەکەم:** سەیری خەڵکم کرد بینیم هەرکەسێك مەعشوق و خۆشەویستێکی هەیە، هەندێك لەو خۆشەویستانە هاوەڵێتی تا نەخۆشی سەرەمەرگ دەکەن هەندێکی تریان تا لێواری گۆڕ، پاشان دەگەڕێنەوەو بە تەنها جێی دەهێڵن، کەسیان لەگەڵیا ناچنە ناو گۆڕەکەوە. بیرم کردەوە ووتم باشترین خۆشەویست بۆ مرۆڤ کە لەگەڵیدا بچێتە ناو گۆڕو هاودەمی بکات لە کاروکردەوەی چاك باشترم دەست نەکەوت، لەبەر ئەوە ئەوم کردە خۆشەویستی خۆم، تا ببێتە هاودەم و ڕوناککەرەوەی گۆڕەکەم.

**سوودی دووەم:** خەڵکم بینی هەواو ئارەزووەکانی خۆیان دەپەرستن و زۆر هەڵپەی ڕاگرتن و بەجێهێنانی داواکانی نەفسی بەدکاریان دەکەن منیش بیرم لەم ئایەتە کردەوە﴿وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِ وَنَهَى النَّفْسَ عَنِ الْهَوَى* فَإِنَّ الْجَنَّةَ هِيَ الْمَأْوَى﴾ واتە: هەرکەس لەبارەگای پەروەردگاری خۆی بترسێ و قەدەغەی نەفسی بکات لە هەواو ئارەزووەکان ئەوە شوێنی بەهەشتە. دڵنیا بووم کە قورئان حەقەو ڕاست دەفەرمووێت بۆیە بڕیارمدا بەپێچەوانەی هەواو ئارەزووەکانم

هولیمەوەو بەگوێی نەکەم تاوای لێهات کە بەگوێڕایەڵی خوا ڕازی بوو حەزی لێدەکرد.

**سوودی سێیەم:** بینیم خەڵکی هەرکەسەو خەریکی کۆکردنەوەی بەشی خویەتی لە کەلاوەی دونیا و توونـد دەستی پێوەگرتووە، منیش ئەم ئایەتەم هێنایە بەر چاوی خۆم﴿مَا عِندَكُمْ يَنفَدُ وَمَا عِندَ اللّهِ بَاقٍ﴾(النحل/٩٦) واتە: بینیم خەلکی هەریەکەو هەڵپەی ئەوە دەکات لەکەلاوەی دونیا بەشی خۆیان ببەن. منیش ئەو ئایەتەم هێنایە بەرچاوی خۆم کە دەفەرموویێت: ئەوەی کە لای ئێوەیە نیادەچێت و تەواو دەبێت، بەلاّم ئەوەی لای خوایە دەمێنێتەوە. لەبەر ئەوە ئەوەی لە دونیا بەدەستم دەهێنا بەزۆری لەڕێی خوادا بەسەر هەژاراندا دابەشم دەکرد.

**سوودی چوارەم:** هەندێ خەڵکم دەبینی کە شەرەفمەندی و سەربەرزی خوی لە زۆری عەشیرەت و خزم وکەسدا دەبینی و پێیان لـووت بەرز دەبوو. هەندێکی تر وای بۆ دەچوون کە کۆکردنەوەی سەروەت و سامان و منداڵ زوری سەروەری و گەورەییە، شانازی پێوە دەکردن، هەندێکی تریان لە زەوتکردنی ماڵی خەڵك و ستەم و ڕشتنی خوێنی خەڵکیدا دەیبینی، کەسانێکی تر لە زیادە ڕەوی لە خەرجی زۆردا دەیبینی، منیش ئەو ئایەتەم هێنایە بەرچاو﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ﴾(الحجرات/١٣) واتە: بەڕێزترین کەستان لای خوای گەورە بەتەقواترین کەستانە. لەبەرئەوە تەقواو پارێزگاری و لەخوا ترسانم هەڵبژارد، چونکە دڵنیا بووم کە قورئانی پیرۆز ڕاستگۆو درووستە وەگومان و بۆچوونەکانی ئەوانە هەمووی بەتاڵ و خەیاڵ بوو.

**سوودی پێنجەم:** خەڵکیم بینی هەندێکیان تانەوتەشەر دەدەن و بەخراپ باسی ئەوی تری دەکرد، هەنـدێك غەیبەتی هەنـدێکی تریان دەکرد، ئەوەش بەهۆی ئیرەیی بە ماڵ و منداڵ و زانستێکەوە کە خوا بەهەندێکی تریانی بەخشی

بوو. منیش ئەم ئایەتەم کردە پەیامکاری خۆم ﴿نَحْنُ قَسَمْنَا بَيْنَهُم مَّعِيشَتَهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا﴾(الزخرف/٣٢) واتە: ئێمە بژێوی ژیانمان لە نێوانیاندا دابەش کردووە. ئەوە لای من ڕۆشن بوو کەدابەشکردنەکە لەلایەن خواوەیە لەبەر ئەوە ئیرەیی بە هیچ کەس نابەم، ڕازیم بەبەشی خوا.

سوودی شەشەم: بینیم خەڵکی هەندێکیان دوژمنایەتی هەندێکی تریان دەکەن بۆ مەبەستێك یان بەهۆیەکەوە، بەڵام من سەرنجی ئەم ئایەتەمدا کەدوژمنم بۆ دیاری دەکات﴿إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوًّا﴾(فاطر/١٦) واتە: بێگومان شەیتان دوژمنی ئێوەیە، ئێوەش ئەو بە دوژمنی خۆتان دابنێن. لێرەدا بۆم دەرکەوت کەتەنها دوژمنایەتی شەیتان پێویستەو دوژمنایەتی کەسی تر دروست نییە.

سوودی حەوتەم: بینیم خەڵکی هەوڵی زۆر دەدات بۆ بژێوی ژیان بەشێوەیەك کە لە گومانلێکراوو حەرام ناگەڕێتەوە. تەنانەت خۆی زەلیل و داماو دەکات لەبەرامبەر دەست خستنی شتێکی کەم، بەڵام من ئەم ئایەتەم کردە بنەما لەم بوارەدا﴿وَمَا مِن دَآبَّةٍ فِي الأَرْضِ إِلاَّ عَلَى اللَّهِ رِزْقُهَا﴾(هود/٦) واتە: هیچ زیندەوەرێك لەزەویدا نییە کەڕۆزی لای خوا نەبێت. لێرەوە تێگەیشتم کە ڕۆزی من لای خوایەو ئەو گرنتی داوە، خۆم بە پەرستنیەوە خەریککرد خۆم لەهەموو هێزێکی تر بێنیاز کرد.

سوودی هەشتەم: بینیم هەرکەسێك پشتوپەنایەکی هەیە لەدروستکراوان، درهەم و دینار، هەندێك پلەوپایەی بۆ خۆی داناوە، بەڵام منیش ئەم ئایەتەم هێنایە بەرچاوم﴿وَمَن يَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ فَهُوَ حَسْبُهُ﴾(الطلاق/٣) لەبەر ئەوە پشتم بەخوا بەست و دڵنیام ئەوم بەسە.

(شەقیق) وتی: خوا سەرکەتووترت بکات من سەیری تەورات و ئینجیل و زەبور و قورئانم کردووە، هەرچواریان لە چوارچێوەی ئەو هەشت سوودەدا باس دەکەن.

**١٥ – عن عبدالله بن عباس(رضي الله عنه) عن النّبي(ﷺ) قال: ( من فسر القرآن برأيه فليتبؤ مقعده من النار).أخرجه الترمذي .**

واتــە: لــە عەبــدوڵڵای كــوڕی عەباســەوە(رضي الله عنه) لەپێغەمبــەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: هەركەس قورئان بەبۆچوونی خۆی لێكبداتەوە باشـوێنی خـۆی لــە ئاگر دیاری بكات. قورئانی پیرۆز هەندێكی ئەوی تر تەفسیر دەكات. ئەوەی لــە ئایەتێكدا بە كورتی باسكراوە لەچەند ئایەتی تردا بەدرێژی باســی لێـوە كـراوە. دوای ئــەو بەفــەرموودەی پێغەمبــەر(ﷺ) قورئــان تەفســیر دەكرێــت.دواتــر بەراوبۆچوونی هاوەڵە بــەڕێزەكانی پێغەمبــەر(خــوا لێیــان ڕازی بێــت)، زانایــانی تەفسیر لەسەر ئەو بنچینانەو ڕێزمانی عەرەبی كە قورئانی پێ هاتۆتە خوار تەفسیر دەكەن. هەروەها شتێكیش كە خۆیان بە تەقواو بۆخـوا ژیانیــان پێبەخشــیون بــە جوانترین شێوە تەفسیری قورئانی پیرۆزیان كردووە، بەڵام تەفسیرێك بەمەبەســتی چەسپاندنی مونكەرێك یان قەدەغەكراوێك یان خۆلادان لە ئەنجامدانی فــەرمانێك و كردن یان ووتن یان ڕۆیشتن بۆ حەرامێك كە دەقێكی ڕوونی لەسەر هــاتووە. یان تەنها بۆ ئەوەبێت كە ناوی بچێتە ڕیزی موفەسیرینەوە بۆ ناوبانگ دەركردن، ئەوەیە كە فەرموودەكە ئاگاداری و هۆشیاری دەربارە داوە.

ئەبوبــەكری ســدیق دەفــەرمووێت: چ زەوییــەك ڕامــدەگرێت یــان چ ئاسمانێك سێبەرم بۆ دەكات ئەگەر بە ڕاوبۆچوونی خۆم قورئانم تەفسیر كرد.

ئەبو دەرداء (ﷺ) دەفەرمووێت: کەسێك زانا نییە بە قورئـان تـا نـەبینیّ کە قورئان چەند تەفسیرێکی هەیە، واتە زیاد لەمانایەك هەڵدەگرێت. هـەر ئـەوە بوو پاڵی بە زانایانەوەنا چەندین بەرگ لـە پەرتووك دەربکەن کە هەڵوێستە کردن و تەئـەمولاتی جـوان و لایەنـەکانی تەفسـیری قورئـان لـەخۆ بگرێـت وەکـو تەفسیری( طبری، في ظلال القران) چەندین پەرتوکی تەفسیری تر هەیە کە پشتیان پیّ دەبەسترێت. هەروەها تەفسـیرەکانی (طـبري، قـرطي، ابـن کـثیر، الألوسـي، القاسمي، البغوي، خازن، منار) تەفسیری کورتکراوەش وەکو( جلالین، بیضاوي، نسفي، تسهیل، تەفسیری ئاسان).

**١٦ – عن جندب بن عبدالله(ﷺ) عن النَّبي(ﷺ) قال: اقرأوا القرآن ما ائتلفت عليه قلوبكم فاذا اختلفتم فيه فقوموا عنه.** ( رواه شيخان)

واتە: قورئان بخوێنن و لـێکیبدەنەوە تائەوەی کە دڵەکانتان یەکدەخات و خۆشەویستی زیاد دەکات، بەڵام ئەگەر جیاوازی و ڕای جۆراوجـۆر درووسـت بوو هەستن لـەسەری.

مەبەست لـە(اقرأوا) خواش باشتر دەزانێت واتە دراسـەو لێکۆڵینـەوەی لـەسەر بکەن( اختلاف)ش هەر جـۆرە جیاوازییـەك لـە تەفسـیر، لـە مانـا، یـان بنەماکانی تەجوید، یـا زانسـتی قورئـان، یـان استنباط و هـەڵگۆزان.... هتـد. هەرچییەك کە نیگەرانی و دووپارچەیی دروست بکات وە ببێتە مایـەی لاوازی و لـەیەك خوێندن. ئـەوە پێویسـتە واز لـە خوێندنـەوەو لێکدانەوەشـی بهێـنن کـە نیشانەی دووبەرەکی دەرکەوت، چونکە بەرەکەتی قورئان خوێندنەکە نامێنێت و شەیتان دەچێتە ناوەوە بۆئەوەی حەزە دەروونییەکانی مـرۆڤ لـە خۆدەرخسـتن و لـەخۆڕازیبوون و خۆپەرستی بهەژێنێت.

سەهلی تەستەری(ﷺ) دەڵێت: لـە قورئانـدا دوو ئایـەت هەیـە چـەندە توندن بەرامبەر ئەوانەی دەمەدەمە بەرامبەر قورئـان دەکـەن: ﴿مَـا يُجَـادِلُ فِـي آيَاتِ اللَّـهِ إِلَّـا الَّـذِينَ كَفَـرُوا﴾(غـافر/٤) واتـە: کەسـانێك دەمـە دەمـەو جـەدەل لەئایەتەکانی خوادا دەکەن کافرن. بەو مانایەی کە بەهۆی هوای نەفس و بیری تەسکی خۆیانەوە کێ بەرکێ و ملـملانێ لـە بەرامبەر ئایەتەکانی خـوادا دەکـەن، ئایەتی دووەم ﴿وَإِنَّ الَّذِينَ اخْتَلَفُواْ فِي الْكِتَابِ لَفِي شِقَاقٍ بَعِيدٍ﴾(البقرة/١٧٦) واتە: ئەوانەی لـە ڕاستێتی قورئان گومانیان هەیەو هەریەکەیان قسەیەکی هەیە دەربارەی و جیاوازن لـەسەری.. ئەوانە گومڕان و لـە بێنەو بەردەو مشتومڕێکی نـاخۆش و ناکۆکیەکی قوڵدان..

یەکێك لـەهۆکارە سەرەکییەکانی جیـاوازی بریتییـە لـە دەمـەدەم، کـە خوای گەورە قەدەغەی کردووە لـە ئایەتە پیرۆزەکەی پێشتردا، واتـە دەمـەدەم و کێ بەرکێ لـەقورئانی پیرۆزدا قەدەغە کراوە جا ئەوە لـە قورئاندا بێـت یاخودنـا، ئەگەر بەهۆی تەعەسوب ودەمارگیری بۆ ڕاو بۆچوونی خۆی وە بەرگری کردن لـێ بەهەموو شێوازێکی ڕاست و ناڕاسـت. وە پێغەمبـەریش(ﷺ) پاداشـتی ئـەو کەسەی کەواز لـە جەدەل و دەمەدەمە دەهێنێت دیاری کردووەکە خوای گـەورە خانوویەکی لـە ناوەڕاستی بەهەشتدا بۆ دروست دەکـات ئەگـەر لەسـەر ناهـەق بێت. بەڵام دەمەدەمەو مل ملانێکە بەرگری بێت لـەڕاستی دژی کەسانێکی دوور لـەڕاسـتی ئـەوە پێویسـتە بـەئامۆژگاری جـوان بێـت هـەروەك خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿ ادْعُ إِلِى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِـالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾(النحل/١٢٥) واتە: بانگەواز بۆ ڕێبازی پەروەردگاری خۆت بکـە بـە دانایی و ئامۆژگاری جوان وەباشترین شێوە پەیڤینیان لـەگەڵ بکە. ئەو جەدەلـەی کەلـەئایەتەکـەدا هـاتووە ئـەوە نییـە کـە لـە فەرموودەکـەدا قەدەغـەکراوە کـە

هەڵقوڵاوی ئارەزووەکانی نەفس و خۆپەرستییە. بەڵام جیاوازی لە تێڕوانینەکانیدا کە لەسەر بنەمای ڕاست و دروست سەرچاوەی گرتووە وەمەبەست لێی ئیجتیهادو هەڵگواستنە لەگەڵ جۆرێك لەئەدەب و ڕێزگرتنی ڕای جیاوازی بەرامبەر ناچێتە چوارچێوەی ئەوەی کە خوا قەدەغەی کردووە، چونکە خوای گەورە مرۆڤەکانی بەجیاواز دروست کردووە و تواناو لێهاتنەکانیان بەپێی تێگەیشتن و پێگەیشتنیان جیاوازە وە لەهەڵسوکەوتی ڕۆژانەکانیاندا دەنگ دەداتەوە.

١٧- قال إبن عباس ((رضي الله عنه)) : توفي رسول الله (ﷺ) وأنا إبن عشر سنين وقد قرأت المحكم فقلتُ له: وما المحكم، قال: المفصل وهو من الحجرات. ( رواه البخاري)

واتە: کوڕی عەباس دەفەرمووی: پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەفاتی کرد من تەمەنم دەساڵان بوو وە مەحکەمم خویندەوە پێم ووت: مەحکەم چییە، فەرمووی: بریتییە ((المفصل)) کە لەسورەتی (الحجرات) دایە.

- عبداللەی کوڕی عەباس (رضي الله عنه) کاتێ دەفەرمووێ من مەحکەمم خوێندەوە تەمەنم دەساڵان بوو مەبەستی لەوەیە کە جوزئەکانی کۆتایی لەقورئان لەبەر کردووە لە سورەتی (الحجرات) ەوە تاسورەتی (الناس).

عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت وای پێ خۆش بوو کەمنداڵ پێنج ئایەت پێنج ئایەت فێر بکرێت وە لەو بارەیەوە ڕیوایەتێك هەیە لە( أبي العالیه)وە ووتویەتی: فێری قورئان بن پێنج ئایەت پێنج ئایەت، چونکە پێغەمبەر( ﷺ) پێنج پێنج لە جبریلی وەردەگرت.

وەلە ریوایەتێکی ترﷺ( من تعلمه خمسا خمسا لم ینسه) واتە: هەرکەس پێنج پێنج فێری ببێت بیری ناچێتەوە. مەبەست لێرەدا ئەوەیە کەجبریل زۆربەی جارەکان پێنج ئایەتی دابەزاندووە، بەلام جار هەبووە زیاتریش بووە وەهەندێك جاریش یەك ئایەت یان بەشێکی ئایەتێکی دابەزاندووە.

یەکێك لە مافەکانی منداڵ بەسەر دایك و باوکییەوە ئەوەیە کە فێری قورئانی بکەن وە لەوەدا پاداشتی گەورەی دەست دەکەوێت وەفەرموودەش لەو بارەیەوە دواتر باسی لێوەدەکەین. ئاینی پیرۆزی ئیسلام هانمان دەدات کەمنداڵەکانمان فێری قورئان بکەین، پێغەمبەری خوا( ﷺ) لەجەنگی بەدردا فیدیەی لە ئەسیرەکان قبوڵ کرد بەوەی کە ژمارەیەك لەمنداڵی موسڵمانان فێری خوێندنەوەو نوسین بکەن کەئەوە بەڵگەیە لەسەر گرنگیدان بەفێرکردنی منداڵان. هەروەك فێربوونی قورئان لەمنداڵیدا وای لێدەکات لەسەر بنچینەیەکی ڕاست و دروستی ڕەوشتی و هاوسەنگی پێبگات، هەروەها وەرگرتنی قورئان وەکو بەڵگەیەك لەژیاندا زیادەیەکە بۆبەهێزکردنی توانای منداڵ لەسەر لەبەرکردن هەر لەسەرەتای تەمەنیەوە وەدەبێتە هۆی بەهێزکردنی توانایی و بیرتیژی و زمان پاراوی وەدەبێتە یارمەتیدەرێك بۆفێربوونی هەموو زانستەکانی تر.



# دەروازەی سێهەم
# لەبەرکردنی قورئان

١٨ – عن ابن عباس( ﷺ) عن النَبي( ﷺ) قال (( ان الذي ليس في جوفه شيء من القرآن كالبيت الخرب)) ( رواه احمد والحاكم والترمذي وصححه)

واتــه: بێگومــان ئەوكەســەی شــتێك لــەقورئان لەدڵیــدا نییــە وەكــو خانوویەكی ڕوخاو وایە.

لەبەركردنی ئەندازەیەك لــەقورئان بــۆ ئەنجامــدانی نوێــژ فــەرزی عەینــە لەسەر هەموو موسڵمانێك، چونكە هەرشتێك ببێتە هۆی تــەواوكردنی واجبێــك ئەویش واجبە (مالايتم الواجب الا به فهو واجب) بــەڵام ئــەم فەرموودەیــە بــاس لەزیاتر لەوە دەكات وەهانی موسڵمانان دەدات بۆ ئــەوەی تــا دەتــوانن زۆرتــر لەقورئان لەبەربكەن كەواتــە ئــەوە ســوننەتێكی موئەكــەدە. زانایــان ڕاجیــاوازن لەسەرئەوەی كامیان باشترە، خوێندنی قورئان لە(مصحف)دا یان خوێندنی لەبەر، هەندێك لەزانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست لەجۆری خوێندنەكەدا لەوەیە كــەئایا كامیان خشوعی زیاتر دەست دەكــەوێت، لەخوێنــدن لــەناو(مصــحف)دا وەبــە سەیركردنی پەڕەكانی قورئان یان لەبــەردا، هــەركامیان خشــوعی زیــاتر تیــابوو ئــەوەیان باشــترە، جــا ئەگــەر هــەردووكیان وەكــو یــەك بــوون ئــەوا خوێنــدن لەناو(مصحف)دا باشترە.

١٩ – عن ابي هريرة( ﷺ) قال: بعث رســول الله( ﷺ) بعثــاً وهــم ذو عدد فاستقراهم، فقرأه كل رجل منهم ما معه من القــرآن فــأتى علــى رجــل مــن احدثهم سناً فقــال (مامعــك يــافلان)؟ فقــال: معــي كــذا وكــذا وســورة البقــرة

قال:( امعك سورة البقرة)؟ قال: نعم قال:(اذهب فأنت اميرهم) فقال: رجل من اشرفهم والله يارسول الله(ﷺ) ما منعني ان اتعلّم سورة البقرة الا خشية ان لااقوم بها فقال رسول الله( ﷺ) : تعلموا القرآن فاقرأوا وأقرئوا فان مثل القرآن لمن تعلّمه فقرأه وقام به كمثل جراب محشوٍ مسكاً يفوح بريحه كل مكان ومثل من تعلّمه فيرقد وهو في جوفه كمثل جراب وكيء على مسك. (رواه النسائي وابن ماجد وابن حبان والترمذي وصححاه)

واتە: لەئەبی هورەیرەوە(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا( ﷺ) کۆمەڵێکی نارد وەکو نوێنەرایەتی کە لەژمارەیەك پێکهاتبوون، قورئانی پێ خوێندنەوە، هەرپیاوێك چەندی لەقورئان لابوو دەیخوێندەوە لەدوای هەموویان پیاوێك هات لەهەموویان گەنجتر بوو، فەرمووی:( چیت لایە ئەی فلان؟) وتی: ئەوەندە و ئەوەندە لەگەڵ سورەتی(البقرة) پێغەمبەر( ﷺ) فەرموی: سورەتی(البقرة)ت لەلایە یان لەبەرە؟ ووتی: بەڵێ، فەرمووی: برۆ تۆ پێشەوایان بە. پیاوێك کە کەسایەتییەکی بەرزی هەبوو وتی: بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا هیچ شتێك بەری لێ نەگرتم لە لەبەرکردنی سورەتی(البقرة) تەنها ترس نەبێت لەوەی کەنەتوانم پێی هەستم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: قورئان فێربن وە بیخوێننەوە وەبەخەڵکی بخوێننەوە، چونکە نموونەی قورئان بۆ کەسێك فێری ببێت، لەبەری بکات و بیخوێنێتەوەو کاری پێ بکات وەکو نموونەی جەواڵێك(جراب)ە تا پربێت لە بۆنی خۆشی میسك کە بەبۆنی خۆشی هەموو شوێنێك پربکات، وەنموونەی ئەوەی کە قورئان فێردەبێت و پاڵ دەداتەوە وەکو نموونەی جەواڵێك وایە کە ئاخنرابێت بە مسك. بەوشێوەیە خوای گەورە کەسانێك بەرز دەکاتەوە کە زانان وە رێزیان دەدات بەسەر کەسانی تردا لەژیانی دونیادا وە پاداشتی رۆژی دوایی زۆر گەورەترە، وە لەبەرکردنی قورئان یەکێکە

لەبەڵگە سەرەکییەکانی زانستی کەسێك وەپاشان ڕێـزدار کردنـی و وەرگرتنـی پلەی بالاّ.

ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نابێت مرۆڤی موسڵمان خۆی لابدات لە لەبەر کردنی ئایەتێك یان سورەتێك گوایا لەترسی ئەوەی کەناتوانێت پێی هەستێت و کاری پێ بکات، بەڵکو پێویستە چەندی لە تواناداا هەیە لەبـەری بکات، چونکە قورئانی پیرۆز فەڕو بەرەکەتە لە ناخی باوەڕداردا وەهەر ناخ و دڵ و دەرونێك بێبەش بێت لێی وەکوماڵێکی ڕوخـاو و کـەلاوە وایـە. جـا ئەگـەر نەوکەسەی لەبەری دەکات پێی هەسـتێت و بتـواتێ هـەموو واجبـەکانی بـەجێ بهێنێت گرنگ ئەوەیە کە کەسێکی بۆنخۆش و تـام شـیرین دەردەچـێت. کەواتـە قورئان لـەبەرکردنەکەی پێوەی دەربکەوێت یان نا واتە کەسـانی تـر سـوودی لێ وەربگرن یان نا گرنگ ئەوەیە ئەو شەرەفەی بەردەکەوێت.

• ٢٠ – عن سـهل بـن سـعد( ﷺ) قـال: اتـت ان النَّبـي ( ﷺ): امـرأة فقالت: انها وهبت نفسـها لله ولرسوله، فقال: مالي في النسـاء مـن حاجـة، فقـال رجل زوجنيها قال: اعطيها ثوباً، قال: لا اجد، قال: اعطِها ولو خاتمـاً مـن حديـد فاعتل ذلك، فقال: مامعك من القران؟ قال: كذا وكـذا، قـال: قـد زوجتـك بمـا معك من القرآن. ( متفق عليه)

واتە: لە سەهلی کوڕی سەعدەوە( ﷺ) فەرمووی: ئافرەتێك هاتـە لای پێغەمبەر(ﷺ) ووتی: من خۆم بەخشیوە بە خـواو پێغەمبەرەکـەی. پێغەمبـەر( ﷺ) فەرمووی: پێویسـتیم بـە ژن نییـە. پیاوێـك ووتـی: بیکـەن بـە هاوسـەری مـن، پێغەمبەر( ﷺ) فەرمووی: کراسێکی پێ ببەخشە، ووتی: نیمە، فەرمووی: بیدەرێ ئەگەر مستیلـەیەکی ئاسنیش بێت، ئەوەشی نەبوو، پێغەمبەر فەرمووی: لــەقورئان

چەندت لەبەرە؟ ووتی: ئەوەندە و ئەوەندە، فەرمووی: ئەوە مارەم کرد بەوەی کە لەبەرتە لەقورئان.

ئەم فەرموودەیە سونەتی کەمی مارەیی پیشان دەدات لەسەرەتای ڕۆژی ئیسلامی زێڕیندا، سەرەتا بەکراسێك دەستی پێ کرد پاشان بەشتێکی بەرجەستە ئەگەرچی موستیلەیەکی ئاسنیش بێت پاشان سێهەمیان ئەوەی لەبەری بوو لەقورئان، واتە مارەییەکەی ئەو قورئانەی لەبەریەتی فێری بکات.

٢١- عن عمر بن الخطاب( ﷺ) ان النبي (ﷺ) قال: ان الله يرفع بهذا الكتاب اقواماً ويضع به آخرين. ( رواه مسلم) واتە: بێگومان خوای گەورە بەم قورئانە هەندێك نەتەوە بەرز دەکاتەوەو هەندێکی تریش دادەبەزێنێت.

ئەوانەی کەخوا بەرزی کردنەوە بەم قورئانە ئەوانە بوون کە فێری بوون و لەبەریان کردو و خەڵکیان فێرکرد وە خۆشیان کاریان پێ کرد، بەڵام ئەوانەی کە دایبەزاندن بەو قورئانە ئەوانە بوون و ئەوانەن کەبێ باوەڕن و ئینکاری دەکەن و بێ ڕێزی دەنوێنن بەرامبەر بەقورئانەکەو هەڵگرانی قورئانەکە. هەروەها ئەوەشی لێ دەخوێندرێتەوە کەهەر لەناو موسڵمانیشدا کەسێك کە زیاتر لە خزمەت قورئاندا بێت وکاری پێ بکات وەزانستە قورئانییەکانی زیاتر لابێت ئەو شایەنی پێشەوایەتییە.

هەروەك و لەفەرموودەکەی پێشوتردا دەرکەوت کە پێغەمبەر (ﷺ) کەسێکی کردە پێشەواو ئەمیری ئەو موسوڵمانانەی کەناردنی بۆ کارێك کە لە هەموویان گەنج تر بوو، لەبەر ئەوەی لە هەموویان زیاتر قورئانی لەبەر بوو.

وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەجەنگی ئوحوددا شەهیدەکانی دوو دوو ئەخستە گۆڕێکەوە وە پرسیاری دەکرد: کامیان قورئانی زیاتر لەبەرە ئەوەیانی

بەش دەخست، ئەمەش نیشانەی ئەوەیە کەسێك کەزیاتر لەخزمەت قورئاندایە پێویستە ڕێز و حورمەتی زیاتر لێ بگیرێ و شایستەی پێشەوای زیاترە.

٢٢- عن عبدالله بن مسعود (ﷺ) عن النّبي (ﷺ) قال: بئسما لاحدكم ان يقول نسيت آية كيت وكيت بل هو نسي استذكروا القرآن فلهو أشد تقصياً من صدور الرجال من النعم. (رواه الشيخان و الترمذي)

واته: خراپترین شتێك بۆ یەكێك لەئێوە ئەوەیە كە بڵێت ئایەتی ئەوەم لەبیر چۆتەوە. بەڵكو لەبیری براوەتەوە یادی قورئان زۆر بكەنەوە چونكە لەدڵی پیاواندا زۆر بەتوندی هەڵدێت زیاتر لە (النعم). لەبەر ئەوەی لەیەك چون هەیە هەندێ جار لە قورئانی پیرۆزدا یان جیاوازیان هەندێك جار قورئان لەبیر دەچێتەوە ئەگەر بەردەوام دەوری نەكرێتەوە، لەبەر ئەوە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمان دەكات بە دەوركردنەوەی قورئان بۆ ئەوەی لەبیر نەچێتەوە.

ئەوە ئاماژەیە بۆ كەراهەتی لەبیر چونەوە بەهۆی پشت گوێ خستن و كارنەكردن بەئایەتەكان پەنا بەخوا كەئەوە بەكاری خراپ دەدرێتە قەڵەم خوای گەورە دەفەرموێ((وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُ مَعِيشَةً ضَنكاً وَنَحْشُرُهُ يَوْمَ القِيامَةِ أَعْمَى* قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِي أَعْمَى وَقَدْ كُنتُ بَصِيراً*قَالَ كَذَلِكَ أَتَتْكَ آياتُنا فَنَسِيتَهَا وَكَذَلِكَ الْيَوْمَ تُنسَى)). (طه/١٢٤-١٢٥)

واته: هەركەس ڕو وەربگێڕێت لەبەرنامەو یادی من و پشتی تێ بكات بێ گومان بۆ ئەو جۆرە كەسانە ژیانێكی ترش و تاڵ و ناخۆش پێش دێت، لەڕۆژی قیامەتیشدا بەكوێری حەشری دەكەین.

ئەو جۆرە كەسە دەڵێت ئەی پەروەردگار بۆ بەكوێری حەشرت كردم خۆمن كاتی خۆی چاوساغ و بینا بووم لەوەلامدا خوا دەفەرموێت تۆ ئابەو شێوەیە بویت (كوێر بویت لەئاستی ) ئایەت و بەڵگەكانی ئێمەدا كاتێك پێت

ڕادەگەیەنرا، ئێمەش ئەمڕۆ ئاوا مامەڵەی کەسێکی لەبیر کراوت لەگەڵ دا دەکەین (لەسزا و ئازاردا دەهێڵرێیتەوە) فەرموودەکەی پێشو بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەدەگونجێ مرۆڤ توشی لەبیر چونەوە ببێت بەڵام پێویستە لەسەر مرۆڤ هەوڵ بدات و کاربکات بەخوێندن و دەور کردنەوە بۆ ڕزگار بوون لە لەبیر چوونەوە خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ سَنُقْرِؤُكَ فَلَا تَنسَى* إِلَّا مَا شَاء اللَّهُ إِنَّهُ يَعْلَمُ الْجَهْرَ وَمَا يَخْفَى﴾. (الأعلى/٦-٧)

واتە: ئەی (محمد) ئێمە قورئانت لەڕوی جبرەئیلەوە بەسەردا دەخوێنینەوە، ئیتر هەرگیز لەبیرت ناچێتەوە مەگەر شتێك ویستی خوای لەسەربێت، چونکە بەڕاستی خوا ئاگادارە بەو شتانەی کە ئاشکراو دیارن یاخود شاراوەو نهێنین.

٢٣- عن عبادة بن الصامت (ﷺ)قال: قال رسول الله (ﷺ): (( مامن امير عشرة الا يؤتى به يوم القيامة مغلولا لايفكه منها الا عدله ومامن رجل تعلّم القران ثم نسيه الا لقي الله يوم القيامة اجذم)) (رواه الامام احمد) . واتە: هەرکەسێك ئەمیری دەکەس بێت لەڕۆژی قیامەتدا بەدەست و پێ بەستراوییەوە دەهێنرێت هیچ شتێك نایکاتەوە مەگەر دادوەری و دادپەروەری بەرامبەریان، وە هەرکەسێ قورئان فێرببێت و لەبەری بکات و پاشان بیری بچێتەوە یان لەبیری خۆی بباتەوە کاتێك دەگات بەخوای گەورە بێ دەست وپەل وپۆیە یان دەست براوە.

زەحاکی کوڕی مزاحیم دەڵێت: هەرکەسێك قورئان فێرببێ و لەبەری بکات پاشان لەبیری بچێتەوە وە ئەوە بەهۆی گوناهێکەوەیە کە ئەنجامی داوە چونکە خوای گەورە دەفەرمووێ:﴿ وَمَا أَصَابَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ﴾. (سورة الشورى/٣٠)

واتە: هەر بەلاو نەهامەتیەکتان بەسەر هاتبێت ئەوە دەرەنجامی ئەو کار و کردەوانەیە کەبەئارەزووی خۆتان دەتان کرد، پێشەوایەتی و سەرۆکایەتی و بەرپرسێتی هەرچەندە لە بازنەیەکی بچوکدا بێت ئەگەر تەنانەت بەرامبەر بە دەکەس و کەمتریش بێت پێویستە دادپەروەرانە مامەڵیان لەگەڵدا بکرێت خۆ ئەگەر وانەبوو ئەوا کۆت و بەندی دەست و پێی لەرۆژی دوایدا چاوەڕێ دەکرێت وەسزاو ئازاری دۆزەخ تۆڵەی دەبێت، دەربارەی لەبیرچونەوەش یان لەبیر بردنەوە وەپشت تێ کردن کەفەرموودەکە ئاماژەی پێکردووە زیاتر مەبەست کارپێنەکردن و فەرامۆش کردنی قورئانە، بەلام لەبیر چونەوەی ئایەتە لەبەرکراوەکان دەگونجێ مەبەستی فەرمودەکە ئەوەش بگێرێتەوە خواش زاناترە، سزای لەبیر چونەوەش لەرۆژی دوایدا هەروەك فەرمودەکە ئاماژەی پێکردووە بریتییە لەکەم ئەندام بوون بەوەی کە دەستی ببرێت کەوەکو کەم و کورتی زانستی وایە لەئەنجامی لەبیر چونەوە لەدنیادا چونکە زۆربەی سزاکان کەدیاری کراون لە ڕەگەزی ئەو کارەن کە ئەنجام دراوە.

٢٤- عن انس بن مالك (ﷺ) عن النَّبي (ﷺ) قال:(( عرضت عليَّ ذنوب امتي فلم ار ذنباً أعظم من سورة من القرآن او آية اوتيها رجل ثم نسيها))

(رواه الترمذي و ابوداؤد).

واتە: پێغەمبەر فەرموویەتی (ﷺ) گوناهەکانی ئومەتەکەم پێش چاوم خرا هیچ گوناهێکم لەگوناهی لەبیر چوونەوەی سورەتێك لە قورئان یان ئایەتێك لەقورئان کەکەسێك فێری بووە یان کاری پێ کردووە گەورەتر نەبینی.

لەبیر چونەوەی ئەو شتانەی کە سەبەردەکرێن چەند هۆکارێکی هەیە لەوانە:

أ- دوبــارە نەکردنەوەکــەی لەبەرکراوەکــە بــەهۆی ســەرقاڵیەکی کتــوپڕەوە کەبەسەریدا دادێت وەدوری دەخاتەوە لێی.

ب- دوبــارە نەکردنــەوەی بــەهۆی ســـەرقاڵیەکی بەردەوامــەوە، ئەگــەر سەرقاڵییەکەی نەیهێشت قورئانەکە دووبارە بکاتەوە وەگرنگیش بــوو پێویســتە هــەوڵ و تێکۆشــان بخاتــە کــار بــۆ ســازکردنی کــاتی پێداچــوونەوە داوای لێ خۆشبوونیش لەخوا بکات.

ج- دوبارە نەکردنەوە پیانەچونەوە بەهۆی تەمەڵی و پشت گوێ خستن ئەوەش ئەو گوناهەیە کە فەرموودەکە ئاماژەی پێکردووە کە تاوانەکەی زۆر گەورەیە.

د- لەبیرچونەوە بەهۆی نەخۆشییەوە ئەمەش هیوا وایە کە خــوای گــەورە لێــی نــەگرێت و پاداشــتی ڕۆژی پــێش نەخۆشــیەکەی کەپێداچــوونەوەی قورئــانی دەکردو ئەگەر ئارامگر بێت لەسەر نەخۆشییەکەی بەهیوای پاداشتی خوای.

هـ- لەبیرچــوونەوە بــەهۆی گوناهــەوە، گونــاه کــردن بەتایبــەتی ســەیرکردنی نامەحرەم یەکێکە لەو هۆکارە کاریگەرانەی زاکیرەی مرۆڤ کزدەکات وەتوانای لەبەرکردنیش کەم دەکاتەوە هەروەکو ئیمامی شافیعی دەفەرمووێت: ( سکاڵای حاڵی خۆمم کرد لای وەکیعی مامۆســتام دەربــارەی کــەمتوانایی لەبــەرکردنم ئەویش ڕێنومایی کــردم بــۆ وازهێنــان لەسەرپێچییەکان وەهــەواڵی پێــدام کــە زانست ڕوناکی و نوورە وە نووری خوا نابەخشرێت بە سەرپێچیکار) .

**٢٥** – عن ابن عباس (رضي الله عنه) قال: بينا عن عند رسـول الله (ﷺ) اذ جـاءه علي بن ابي طالب (رضي الله عنه) فقال بأبي انت وامي، تفلّت هذا القرآن من صدري فما أجدني أقدر عليه فقال له رسول الله (ﷺ) يا ابا الحسن أُعلمـك كلمـات ينفعـك الله بهن، وتنفع بهن من علمته ويثبت ماتعلّمت في صدرك ؟ قال اجل يارسول الله فعلمني . قال اذا كانت ليلة الجمعة فان استطعت ان اتقوم في ثلث الليـل الآخـر

فانها ساعة مشهودة والدعاء فيها مستجاب وقال اخي يعقوب لبنه ( سوف استغفرلكم ربي) يقول حتى تأتي ليلة الجمعة فان لم تستطع فقتم في وسطها فإن لم ستطع فقم في اولها فصل ربع ركعات تقراء في الاولي بفاتحة الكتاب وسورة يس وفي الركعة الثانية بفاتحة الكتاب وحم الدخان وفي الركعة الثالثة بفاتحة الكتاب والم تنزيل السجدة وفي الركعة الرابعة بفاتحة الكتاب وتبارك المفصل، فاذا فرغت من أتشهد فاحمد الله واحسن الثناء على الله وصلّ عليَّ واحسن وعلى سائر النبين واستغفر للمؤمنين والمؤمنات واخوانك الذين سبقوك بالايمان ثم قل في آخر دلك : اللهم ارحمني بترك المعاصي ابداً ما ابقيتني وارحمني ان اتكلّف مالا يعنيني وأرزقني حسن النظر فيما يرضيك عني . اللهم بديع السموات والارض ذا الجلال والاكرام والعزة التي لاترام اسألك ياالله يارحمن بجلالك ونور وجهك ان تنور بكتابك بصري وان تطلق به لساني وان تفرِّج به عن قلبي وان تشرح به صدري وان تُعمل به بدني فانه لايعينني على الحق غيرك ولا يؤتيه الا انت ولاحول ولاقوة الا بالله العلي العظيم يا ابا الحسن تفعل ذلك ثلاث جمع او خمساً او سبعاً تجاب باذن الله والذي بعثني بالحق ما اخطأ مؤمناً قط) قال ابن عباس فوالله مالبث عليّ الا خمساً او سبعاً حتى جاء رسول الله (ﷺ) في ذلك المجلس فقال يارسول الله ولله اني كنت في ماخلا لأخذ الا آربع ايات او نحوهن فاذا قرأتهن على نفسي تفلتن وانا أتعلم اليوم اربعين آية او نحوها فاذا قرآتها علي نفسي فكأنما كتاب الله بين عيني ولقد كنت اسمع الحديث فاذا رددته تفلت وانا اليوم اسمع الاحاديث فاذا تحدثت بها لم اخرم منهاحرفا . فقال له رسول الله (ﷺ):( مؤمن ورب الكعبة يا ابا الحسن ) رواه الحاكم والطبراني واته: لەئیبن عەباسەوە (ﷺ) دەفەرمووێت لەکاتێکدا لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشتبووین علی کوڕی ئەبی تالیب (ﷺ) هاته لای وتی: دایکم باوکم بەقوربانت بن قورئـان لـه سـنگم دەچـێته دەرەوه

توانام بەسەریدانییە (واتە زوو لەبیرم دەچێتەوە) پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەبوحەسەن، چەند وشەیەکت فێر بکەم خوا دەیکاتە سوود بۆ تۆ، وە هەرکەسێ فێر بکەیت سوودی پێ دەگەیەنێت، وەئەوەی فێری بویت و لەبەرت کرد لەسنگت دا دەمێنێتەوە؟ وتی: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا فێرم بکە فەرمووی: ئەگەر شەوی هەینی بوو توانیت سێ یەکی کۆتایی شەو هەستە چونکە کاتێکە نزا تیایدا وەردەگیرێت. یەعقوبی براشم بەکورەکانی فەرموو( سوف أستغفر لكم ربي) پاشان داوای لێ خۆشبونتان بۆ دەکەم لای خوا، فەرمووی کەشەوی هەینی هات ئەگەر نەتتوانی نیوەی شەو هەستە خۆ ئەگەر نەتتوانی ئەوا سەرەتای شەو هەستەو چوار ڕکات نوێژ بکە لە:

**ڕکاتی یەکەم: سورەتی فاتحە + سورەتی یاسین.**

**ڕکاتی دووەم: سورەتی فاتحە + سورەتی دخان.**

**ڕکاتی سێیەم: سورەتی فاتحە + سورەتی سجدە.**

**ڕکاتی چوارەم: سورەتی فاتحە + سورەتی تبارك.**

کەلەتەحیات خوێندن تەواو بوویت، سوپاس و ستایشی باشی خوابکە و صلوات بدە لەسەر من و تەواوی پێغەمبەران، داوای لێخۆشبون بۆ باوەڕدارانی ئافرەت و پیاو و ئەوانە پێش تۆ بە باوەڕەوە کۆچی دوایان کردووە. پاشان بڵێ: خوایە، پەروەروەردگارا ڕەحم پێبکە بەوەی واز لە گوناهکان بهێنم هەتا لە ژیاندا مابم وە ڕەحم پێبکە بەوەی کە تەکلیف بکرێم بەشتێك کە پەیوەست نیە وە ئەوەم پێ ببەخشە کە چاوم لە شتێکەوە بێت کە ڕەزامەندی تۆی تیا بەدەست بهێنم.

خوایە! ئـەی بـەدی هێنـەرو جوانکـاری ئاسمانـەکان و زەوی، خـاوەنی گەورەی و ڕێزو عیزەتێك کە نابـەزێنرێت ، داوات لێ دەکـەم یـا الله یـا رحمـان بەگەورەیت و نووری ڕووت کە چاوەکانم ڕوناك بکەیتەوە بـە قورئانەکـەت، وە رمانم پێ پاك بکەیتـەوە وە دەروو لـە دڵـم بکەیتـەوە، سـنگم فـراوان بکـە و لاشەمی پێ کارا بکە. هیچ کەسێکی تر جگـە لـە تـۆ هاوکـارم نابێـت لەسـەر ڕاستی، وەکەسیش نایبەخشێ جگە لە تۆ، هیچ تواناوهێزێك نی‌یە جگە لای خوا بالادەست و گە ورە.

ئەی ئەباحسن سێ هەینی یان پێـنج یـان حـەوت هـەینی ئـەوە دوبـارە دەکەیتەوە، وەلام دەدرێتەوە بەپشتیوانی خوا، سـوێند بـەو زاتـەی منـی بەحـەق ڕەوانە کردووە هەرگیز باوەردار هەڵە ناکات.

(واتە ئەگەر باوەڕداربێت دەگاتە ئەنجام ). ئیبن عباس وتی: سوێند بەخوا علی پێنج یان حەوت هەینی بەسەرا تێنەپەڕی کەگەڕایەوە لای پێغەمبەر بۆهەمان کۆڕ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا پێشتر چوار ئایەت یان هێندەی ئەوەم دەخوێندەوە یان لەبەر دەکرد کوتوورپڕ لە بیرم دەچووەوە بەلام ئەمڕۆ چل ئایەت لەبەردەکەم و لـەبەر دەخوێنمەوە وەکو ئەوەی قورئانی پـیرۆز لەبـەر چـاوم بێـت، وەکـاتێ گوێم لەفەرموودەیەك دەگرت کەدەمویست بیلێمەوە لەبیرم نەدەما، بەلام ئەمڕۆ کەگوێ لەفەرموودەیەك دەگرم، کاتێك دەمەوێ بیلێمەوە پیتێکی لێناپەڕێنم.

پێغەمبـەر(ﷺ) فـەرمووی: سـوێند بـەخوای کەعبـە باوەڕداریـت ئـەی ئەباحسن ئەوەی فەرمودەکە داوای دەکات زاڵبونە بەسەر لەبیرچونەوەداو پشت بەستن بەخواو نزاو پاڕانەوە کەخوا دامەزراو ڕاوەسـتاوی بکـات کەئـەوەش لـە توانای کەسدا نی یە جگە لە الله .

**لەخوارەوە هەندێك ڕێنمایی پێوست بۆ باش لەبەرکردن و لەبیر نەچوونەوە:-**

١- دیاری کردنی باشترین کات بۆ لەبەرکردن ئەمەش لەکەسێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت بەڵام بەشێوەیەکی گشتی باشترین کات بۆ لەبەرکردن پێش خەوتن بەڵام واباشە دوای لەخەوهەستان ئەوەی لەپێشدا لەبەری کردبوو بیڵێتەوە بۆ ئەوەی بچەسپێ کاتێکی تری باش بەرەبەیانە یان سەرەتای ڕۆژ یان ئەوکاتانەی مرۆڤ تیایدا ئارام و ئاسودەیە.

٢- پێویستە مرۆڤ هۆکاری گونجاو بەکاربهێنێت کە یارمەتی دەدات لەلەبەرکردندا، هەیە سوود لەنووسینەوەی ئەوەی دەیەوێت لەبەری بکات دەبینێت پاشان لەبەرخۆیەوە دەیڵێتەوە، بەڵام لەوکاتەدا چاو دەبڕێتە شوێنی وشەکان لێرەدا تەرکیزی ئەوکەسە لە چاوەکانیدایە. کەسانێکی تر هەن بۆلەبەرکردن ئەو بابەتەی کەلەبەری دەکەن بەدەنگی بەرز دووبارەی دەکەنەوە بەشێوەیەك کەخۆی گوێی لەدەنگی خۆی بێت یان گوێ بیستی دەبێت لەئامێرێکی تەسجیل یان ڕادیۆ ئەم کەسەش تەرکیزی لەسەر گوێچکەکانیەتی.

٣- پێویستە مرۆڤ چەند ئایەتێك دیاری بکات دووبارەی بکاتەوە وەچەندبارەی بکاتەوە تالەبەری دەکات دواتریش چەند بارەی دەکاتەوە تالەدڵیدا بچەسپێت پاشان ماوە ماوە لە چەند کاتێکی جیاوازدا دووبارەی دەکاتەوە بەشێوەیەك زاڵبێت بەسەر لەبیرچوونەوەیدا.

٤- هەروەها لەسەر مرۆڤ پێویستە ئەو ئایەتانەی لەئەلفازدا لەیەکچوونیان تێدایە پەیوەستیان بکات بەمێشکی خۆیەوە وەلەگەڵ ئەوشوێنەی کەلەسورەتەکەدان یان لەگەڵ چەند ئایەتێکی تردا یان لەگەڵ شوێنی نووسینیان لەپەڕەکەدا یان لەگەڵ شێوازی دەربڕینیدا تاکو جیای بکاتەوە لەئایەتەکانی تری

هاوشێوەی کەلـەیەکچـوونیان تیادایـە ئـەوەش بۆئەوەیـە لـەمێشـکیدا ئایەتـەکان هەریەکە بەپێی شوێن و سورەت و ئەو پەڕەیەی کەتیایدا نووسراوە جیا بکاتەوە.

٥- تێگەیشـتنی مانـاو تەفسـیرو هـۆی دابـەزینی ئایـەت و سـورەتەکان هاوکارێکی باشن بۆلـەبەرکردن.

٦- هەرکەسێك بەرنامەڕیژی بکات بۆلـەبەرکردنی قورئانی پـیرۆز کـاتی گونجاو دەرەخسێنێت بۆلـەبەرکردن و دووبارەکردنەوەی، جالـەکاتی پشوودابێت یان لـەکاتی کاردابێت.

٧- پێویستە لـەسەر گەنج یان مێردمندالْ کەئـەو تەمەنـەی خـۆی بەهـەل وەربگرێت بۆلـەبەرکردنی قورئانی پیرۆز، چونکە زیاتر و باشتر زەمینەی سازە وە نامادەگی باشتری هەیە بۆلـەبەرکردن لـەکەسێکی بەتەمەن یان پیر، پێغەمبـەر( ﷺ) دەفەرموویت:(اغتنیم خمسا قبل خمس: شبابك قبل هرمك وصحتك قبـل سـقمك وفراغك قبـل شـغلك وحياتـك قبـل موتـك وغنـاك قبـل فقـرك) ( رواه الحـاكم والبيهقي)عن ابن عباس وأحمد و أبو نعيم في الحلية عن عمرو بن ميمون.

واتە: پێنج شـت بەهـەل و بەغەنیمـەت یـان بەدەسـتکەوت وەربگـرە پـێش بەسەرداهاتنی پێنج شتی تر:

أ- گەنجیت پێش پیریت.

ب- لـەشـاغی و تەندروستیت پێش نەخۆشیت.

ت- بێ ئیشی و دەست بەتالێت پێش سەرقالێت.

پ-ژیانت پێش مردنت.

ج- دەولەمەندیت پێش هەژاریت.

بەراسـتی پێغەمبـەری خـوا ڕاسـتی فـەرمووە لـەو پێـنج شـتەی باسـی کـردووە دەستکەوتی گەورەن بۆمرۆڤ وەکو مالێ سپی وان بۆڕۆژی ڕەش، چونکە بـەری

ڕەنجـی لاوێتـی بۆتەمـەنی پـیری زۆر گرنگـه هـەروەها کـاتی لەشـاغی بۆنەخۆشی.... هتد.

لەفەرموودەکـەی پێغەمبـەردا کـەئیمامی عـەلی فێـری نوێـژ و دوعـا کـرد بۆلەبەرکردنی قورئانی پیرۆز ئاماژەیەك هەیە بەوەی کە پێویستە مرۆڤی بـاوەڕدار دڵنیابێـت لـەوەرگرتنی نـزاو پاڕانـەوەکانی لای خـوای گـەورە هـەروەك لەفەرموودەیەکـدا ئامـاژەی پـێ کـردووە کەدەفـەرمووێت: ( ادعـوا الله وانـتم موقنون بالاجابه وأعلموا ان الله لا يسـتجيب دعـاءً مـن قلـب غافـلٍ لاهٍ) (رواه الترمذي والحاكم عن أبي هريرة (ﷺ) .

واته: نزا بکەن و داوا بکەن لـەخوا بـەوەی کـەئێوه یـەقین و دڵنیایتـان هـەبێت لەوەرگرتنی وەبزانن کەخوای گەورە نزا و پاڕانـەوه لـەدڵێکی بـێ ئاگـا و بـێ هۆش وەرناگرێت بێگومان دڵ کەهۆشـێکی نـەبێت وەك شوو...ی بـەتاڵ وایـه سـەریش کەجۆشـێکی نـەبێت وەکـو زرکـەتاڵ وایـه هـەروەکو (مـەحوی) دەفەرمووێت:

سەرکەجۆشێکی نەبێت من زرکەتاڵم بۆچییه

دڵ کەهۆشێکی نەبێت من شیشەی بەتاڵم بۆچییه

# دەروازەی چوارەم

# کارکردن بە قورئان

٢٦- عن ابي هريرة(ﷺ) عن النبي (ﷺ) قال: (( من قرأ القرآن وعمل بما فيه أُلبس والداه تاجاً يوم القيامة ضوءُه احسن من ضوء الشمس في بيوت الدنيا لوكانت فيكم فما ظنكم بالذي عمل بهذا)) (رواه ابوداود).

واته: لەئەبی هورەیرەوە(ﷺ) لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەس قورئان بخوێنێت و کاربکات بەوەی تیایەتی تاجی ڕێز و گەورەیی دەکرێتە سەری دایك و باوکی لەڕۆژی دواییدا ڕووناکییەکەی باشتر و ڕۆشنترە لەتیشك و ڕووناکی خۆر لەماڵەکانی دونیادا ئەگەر تیاتاندابێت، ئەی گومانتان چییە بەو کەسەی کەخۆی کاری پێدەکات.

ئاماژەی فەرموودەکە بۆڕێز و پلەوپایەی قورئانخوێنە کەکاری پێدەکات پاداشتەکەی تەنها بۆخۆی نییە بەڵکو دایکو باوکیشی دەگرێتەوە ئەگەر باوەڕداربن. بۆچی تاج دەخرێتە سەرسەری دایکوباوکی قورئانخوێن وکاربێکاری، لەکاتێکدا کەئەوان بەوکارە هەڵنەستاون بەڵکو کوڕەکەیان یان کچەکەیان پێی هەستاوە؟!

وەڵامەکەی ئەوەیە کەئەوان بوونە هۆی سازکردنی منداڵەکەیان بۆئەوکارە لەڕێی پەروەردە و فێرکردنی یان لەڕێگەی نزاوپاڕانەوە بۆی یان لەبەرئەوەی باش پێیانگەیاندووە لەڕێی پێدانی خواردن و خواردنەوەی حەڵاڵ. پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرمووێت: (( اذا مات الانسان انقطع عمله الا من ثلاث: صدقة جارية، او

علم ينتفع به، او ولد صالح يدعو له)) ( عن أبي هريرة رواه البخاري في الأدب و مسلم وابوداود و الترمذي و النسائي). واته: ئەگەر مرۆڤ مرد کارەکانی لێی دەبچڕێت و خێری پێ ناگات جگە لەسێ ڕێگەوە:

١- خێرو سەدەقەیەکی بەردەوام.

٢- زانستێك کەسوودی لێ وەربگیرێت.

٣- منداڵێکی ساڵح و چاك نزای بۆبکات.

مرۆڤە مردووەکە بۆتە هۆی ئەنجامدانی ئەو سیانە لەبەرئەوە پاداشتەکەی پێدەگات لەژیان و پاش مردنی. لێرەدا منداڵە ساڵحەکەش کەقورئان دەخوێنێت وکاری پێدەکات، ئەوان هانیان داوە وکارئاسانیان بۆکردووە.

٢٧- عن النواس بن سمعان(ﷺ) قال سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: يؤتى يوم القيامة بالقرآن واهله الذين كانوا يعملون به في الدنيا تقدمه سورة البقرة وآل عمران تحاجّان عن صاحبهما. (رواه مسلم).

واتە: لە نەواسی کوڕی سەمعانەوە(ﷺ) ووتی لەپێغەمبەرم بیست دەیفەرموو: ڕۆژی دوایی قورئان و هەڵگرانی کەکاریان پێکردووە لەدونیادا دەهێنرێن سورەتی( البقرة، ال عمران) پێشیان دەکەون و تکا بۆ هاوەڵکەیان دەکەن کەلەبەریان کردوون و کاریان پێکردووە.

ئەبو سەعیدی خەراس( ﷺ) فەرموویەتی: یەکەم تێگەیشتن بۆ قورئانی پیرۆز کارپێکردنیەتی، چونکە زانست و تێگەیشتن و هەڵگواستنی تێدایە وە سەرەتای تێگەیشتنیش گوێگرتن و بینینە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي ذَلِكَ لَذِكْرَى لِمَن كَانَ لَهُ قَلْبٌ أَوْ أَلْقَى السَّمْعَ وَهُوَ شَهِيدٌ﴾ ( ق ٣٧) واتە: لەوەدا یادخستنەوە هەیە بۆ کەسێك خاوەن دڵێکی زیندووبێت یان گوێ هەڵبخات و بەئاگاو هۆشیاربێت. وەدەفەرموێت: ﴿ الَّذِينَ يَسْتَمِعُونَ الْقَوْلَ فَيَتَّبِعُونَ

أَحْسَنَهُ﴾(زمر/١٨) واته: مژدەبدە بەو بەندانەم کەگوێ لەووتەکان دەگرن و شوێن باشترینیان دەکەون ئەم ئایەتە ئاماژە بەوە دەکات کە خەڵك گوێ لەهەموو ووتەکان بگرن، بەڵام دوای باشترینیان بکەون ، قورئانی پیرۆز لە هەمووی باشترینە وەمانای شوێنکەوتنی باشترین ئەوەیەکەکۆمەڵێك زانیاری و بابەتی سەرسوڕهێنەر بۆ دڵەکان دەردەکەوێت لەمیانەی گوێگرتن و تێگەیشتن و هەڵگواستن، گوێ گرتن لە قورئان وەکو ئەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لەجبرئیلی نەبیست تۆش لەوکاتەدا گوێ بیستی دامەزراندنی ئەو ئایەتانە ببیت هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّهُ لَتَنزِيلُ رَبِّ الْعَالَمِينَ* نَزَلَ بِهِ الرُّوحُ الْأَمِينُ* على قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ الْمُنذِرِينَ﴾(الشعراء/١٩٢-١٩٤) واته: ئەو قورئانە لەلایەن پەروەردگاری جیهانیانەوە دابەزیوە کە روح الأمین هێناویەتی وەدای بەزاندۆتە سەر دڵی تۆ ئەی (محمد) بۆ ئەوەی لەوانەبیت کەهۆشیاری بەخش و راچڵەکێنەر بیت.

دارمی لە علیـیەوە وەری گرتووە کەفەرمویەتی ئەی زانستخوازان کاربەزانستەکەتان بکەن چونکە زانا ئەوکەسەیە کە کار بە زانستەکەی دەکات و زانست و کردەوەکەی هاوشانی یەکن، وەکەسانێك ئەبن کەزانست وەر ئەگرن بەڵام کاری پێ ناکەن باری نهێنیان جیاوازە لە باری ئاشکرایان لەگەڵ خەڵکیدا دادەنیشن وەپۆز بەسەر یەکتریدا لێدەدەن بەجۆرێك پیاو تورە دەبێت لەهاونشین و هاورێکەی کاتێك ئەو بەجێبهێڵێت و ڕوو لەکەسێکیتر بکات واتە ئیرەیی لە نێوانیاندا دروست دەبێت.

٢٨- عن عبدالله بن عمرو(رضي الله عنه) عن النبي (ﷺ) قال: ((لاحسد الا في اثنتين: رجل آتاه الله القرآن فهو يقوم به آناء الليل وآناء النهار، و رجل آتاه الله مالاً فهو ينفقه آناء الليل و آناء النهار)) متفق عليه .

واتە: لە عبداللەی بن عەمرەوە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) کە فەرموویەتی: ئیرەی دروست نییە جگە لە دوو حاڵەت: پیاوێك یان کەسێك قورئان فێر بووە و لەبەری کرووە کاری پێدەکات بەشەو و بە ڕۆژ.

وەکەسێك خاوەن ماڵ و سامانێك لێی دەبەخشێ بەشەو و بە ڕۆژ.

حەسودی و ئیرەی خراپ و زەمکراو ئەوەیە کە هیوا خواز بێت نیعمەتێك کە هەیە نەمێنێ و لەناو بچێت. بەلاّم حەسودی باش ئەوەیە کە هیوا بخوازی ئەوەی حەسودیی و ئیرەیی پێدەبرێت لەزانست و ماڵ دەست بخرێت.

هەستانی شەوانە بۆ قورئان خوێندن و فێربوون و لەبەرکردن تام و چێژی تایبەتی خۆی هەیە کەدوورە لەچاوی خەڵکی، بەلاّم بەڕۆژدا بخوێنرێت و کاری پێبکرێت لەبەرچاوی خەڵك بەگوێرەی فەرمانی خوا بەکارکردن وە بۆئەوەی ببێتە سەرمەشق بۆ کەسانی تر تاچاوی لێ بکرێت و پاداشتی لەشوێنکەوتەیی ئەوانیش دەست بکەوێت.

ڕەچاوکردنی زنجیرەبەندی لەفەرموودەکەدا گرنگە، ڕێزو پلەی قورئانخوێن وکارپێکردنی پاشان ڕێزو پلەی ماڵ بەخشین. عەلی کوری ئەبوتالیب(ﷺ) بە(کمیل)ی فەرموو: زانست و زانیاری باشترە لەماڵ وسامان. زانست پارێزگاریت لێدەکات، بەلاّم تۆ پارێزگاری لەماڵ وسامان دەکەیت. زانست فەرمانڕەوایە، بەلاّم ماڵ فەرمانی لەسەر دەکرێت. ماڵ لێدەرکردنی کەمی دەکات، بەلاّم زانست لێبەخشینی زیادی دەکات (کەمکردنی ماڵ بەبەخشین لەڕواڵەتدایە کەخەڵکی وایدەبینێت، بەلاّم لای خوا زیاددەکات)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم فەرموودەیەی بەفەرموودەیەکی تر لێکداوەتەوە کە ئەبی کبشەی ئەنماری(ﷺ)ڕیوایەتی دەکات کەدەفەرموێت: (( مثل هذه الامة مثل اربعة: رجل اتاه الله مالا وعلماً فهو يعمل بعلمه في ماله. ورجل آتاه الله

علما ولم يؤته مالاً فيقول رب لو ان لي مالاً مثل مال فلان لكنت اعمل فيه بمثله فهما في الاجر سواء ( وهذا منه حب لان يكون له مثل ماله فيعمل مايعمل من غير حب زوال النعمة عنه). ورجل آتاه الله مالاً ولم يؤته علما فهو ينفقه في معاصي الله عزوجل. ورجل لم يؤته علماً ولم يؤته مالاً، فيقول: لو ان لي مثل مال فلان لكنت انفقته مثل ما انفقه فيه من المعاصي، فهما في الوزر سواء)) رواه ابن ماجهوالترمذي وقال حسن صحيح.

واته: نموونەی ئەم نەتەوە وەکو نموونەی چوار کەسە: کەسێك خوا زانست و ماڵی پێبەخشیوە، کار بەزانستەکەی دەکات لە ماڵەکەیدا، کەسێکی تر خوا زانستی پێبەخشیوە، بەلام ماڵی نەداوەتێ دەڵێت: خوایە ئەگەر وەکو فلانکەس ماڵت بەمن ببەخشیایە وەکو ئەوم دەکرد. ئەوان هەردووکیان لەپاداشتدا یەکسانن ( ئەوە حەزێکە لەودا کەئەگەر ماڵێکی وەکو ماڵی ئەوی تری هەبوایە وەکو ئەو بەکاری دەهێنا بێئەوەی حەز بەتیاچوونی بکات.) ، کەسێکی تر ماڵ و سامانی هەیە، بەلام زانستی نییە، ماڵەکەی لەسەرپێچی فەرمانی خوادا بەهەدەر دەدات. وەکەسێکی تر نەماڵ وسامانی هەیە و نەزانستی هەیە، دەڵێت: ئەگەر ماڵ و سامانی فلانکەسم دەبوو، وەکو ئەو لەسەرپێچیدا خەرجم دەکرد، ئەوان هەردووکیان لەگوناهو سزادا یەکسانن.

بەلام لەوەدا کەئاواتە خوازبێت ماڵ و سامانی هەبێت بۆ کاری چاکەو خزمەتکردن ببەخشێت بێئەوەی ئاوات بە لەناوچوونی بخوازێت لەدەستی کەسێکی تردا ئەوە لەخێرو چاکەدا هاوشانی ئەو کەسەیە. ئەگەر ئەو بەخشش و نیعمەتە ئاینی بوو وەفەرزیش بوو وەکو باوەڕو نوێژو زەکات، ئەم کێبەرکێیە واجب و پێویستە چونکە ئەگەر وانەکات و ئاواتەخواز نەبێت ئەوا لەگوناهدا

دەمێنێتەوە. کەئەوەش قەدەغەکراوە، بەڵام ئەگەر ئەو نیعمەتانە لە فەضائیلدا بوو وەکو ماڵ بەخشین لەخێرو چاکەدا ئەوە سوننەتە.

**٢٩**– عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنه) عن رسول الله(ﷺ)قال: (( من قرأ القرآن فكأنما استدرجت النبوة بين جنبيه غير انه لا يوحى اليه، ومن قرأ القرآن فرأى أن أحدا اعطي افضل مما اعطي فقد عظّم ماصغّر الله وصغّر ماعظّم الله. وليس ينبغي لحامل القرآن ان يسفه فمن يسفه او يغضب فيمن يغضب او يحتد فيمن يحتد ولكن يعفو ويصفح لفضل القران)) (رواه الطبري) . واتە: هەرکەس قورئان بخوێنێت وەکو ئەوە وایە پێغەمبەرایەتی لەنێوان هەردوو لایدا دەست خستبێت جگە لەوەی کە وەحی( نیگا)ی بۆ نایەت. وە هەرکەس قورئان بخوێنێت و وابینێت کەکەسێکی تر لەم باشتری پێدراوە، ئەوا بەگەورەی داناوە شتێك کە خوا بچووکی کردۆتەوە وەبەبچووکی داناوە شتێك کە خوا گەورەی کردووە.

بۆ قورئانخوێن نییە کەلەبەرامبەر ناژیریدا ناژیرانە مامەڵە بکات یان تورە ببێت لەگەڵ کەسێك کەتورە دەبێت یان توندوتیژبێت وەکو کەسێك کەتوندو تیژی بەکاردەهێنێت، بەڵکو لێبوردەو بەخشندەو سنگ فراوان دەبێت لەبەر رێزی قورئان. پێغەمبەری خوا نیگای بۆ هاتووە لەشێوەی دەقێکی دیاریکراودا کەقورئانی پیرۆزە وە(لفظا) یش وەکو سنە لەسەر زاری پێغەمبەر(ﷺ) .

ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێت و لەخزمەتی قورئاندایە ئەوا ئەوەی کەخوا بەنیگا( وحی) بۆ پێغەمبەری ناردووە دەستی کەوتووە. جیاوازی لەگەڵ پێغەمبەردا ئەوەیە کەئەوکەسە وەحی بۆنایەت. هەربەوشێوەیە زانایان میراتگری پێغەمبەرانن کەئەوان درهەم و دیناریان بەجێ نەهێشتووە بەڵکو زانست و کارکردن پێی و بڵاوکردنەوەی لەناو خەڵکدا بەجێ هێشتووە.

بەگەورە زانینی خوای گەورە لەرێی بەگەورە زانینی قورئانەوە دەبێت، هەرکەس خێروچاکەی دەست بکەوێت واتە بەخششی زۆری خوایی هەبێت پێویستە سوپاسی زۆری خوای گەورە بکات لەسەر ئەو بەخششە زۆرانە ودەست بکات بەمنەتباری بەرامبەر بەخوای گەورە.

عەبدولڵای کوڕی مەسعود(ﷺ)فەرموویەتی: پێویستە قورئانخوێن بناسرێتەوە بەشەوانیدا کاتێك خەڵکی خەوتوون وە بە ڕۆژەکانیدا کاتێ خەڵکی بەڕۆژوو نین و خواردن دەخۆن وە بەدڵ تەنگیدا کاتێك خەڵکی دڵخۆشن بەدونیا وبەگریانیدا کاتێ خەڵکی پێدەکەنن وەبەبێدەنگیا کاتێ خەڵکی بەهەموو لایەکدا قسە فڕێدەدەن وەبەترس و خشوعیدا کاتێك خەڵکی فێڵ دەکەن، وە پێویستە ئارام ونەرم ونیان بێت وەنابێت وشك و گەمژە و قیژن و دەمپیس و جنێوفرۆش ودڕبێت.

هەندێك لەپیاوچاکان وتویانە هەڵگرانی قورئان و قورئانخوێنان لەڕۆژی دواییدا پرسیاریان لێ دەکرێت هەروەکو پێغەمبەران. لەفەرموودە پیرۆزەکەدا هەرزەیی و توڕەیی و توندوتیژی لەقورئانخوێنان قەدەغە کراوە، وە فەرمانیان پێدراوە کەنەرم ونیان و سنگ فراوان و لێبوردەبن. وەهەروەها ڕەوشتی بەرزو ناکاری جوان لەخۆیاندا بەدی بهێنن هەربەوشێوەیە دایکی باوەڕداران عائیشە(ﷺ) وەسفی پێغەمبەری دەکرد کەپرسیاریان لێ کرد دەربارەی ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) ئەویش دەیفەرموو:(( کان خلقه القران)) واتە: خووڕەوشتی پێغەمبەر قورئانی بوو. هەروەك شاعیریش دەڵێت:

قورئانێکی زیندووبوو بەهەڵسوکەوت

وێڵ وگومڕابوو ئەوەی شوێنی نەکەوت

جا ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) خووڕه‌وشتی قورئانی بێت، قورئان له‌ناوماندا ماوه له‌به‌رئه‌وه پێویسته هه‌ڵگرانی قورئان هه‌ڵگری ڕه‌وشته‌كانی پێغه‌مبه‌ربن.

**٣٠**- عن علي بن ابي طالب(ﷺ)عن النبي (ﷺ)قال: من قرأ القرآن واستظهره فأحل حلاله وحرم حرامه أدخله الله به الجنة وشفعه في عشرة من اهل بيته كلهم له النار. ( رواه الترمذي)

واته: هه‌ركه‌س قورئان بخوێنێ و ده‌ریبخات و لێی تێبگات حه‌ڵاڵی حه‌ڵاڵ بكات و حه‌رامه‌كانی حه‌رام بكات ( واز له‌قه‌ده‌غه كراوه‌كانی بهێنێت) خوای گه‌وره ئه‌یخاته به‌هه‌شته‌وه، وه‌ده‌یكاته تكاكار بۆ(١٠) له كه‌سوكاری كه‌هه‌موویان پێویست بووه بچنه ئاگره‌وه.

پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) فه‌رموویه‌تی وه‌كو ڕۆشنكردنه‌وه‌یه‌ك بۆ حه‌ڵاڵ و حه‌رام ((الحلال بين والحرام بين وبينهما امور متشبهات لايعلمهن كثير من الناس. فمن اتقى الشبهات فقد استبرأ لعرضه ودينه ومن وقع في الشبهات وقع في الحرام كراع يرعى حول الحمى يوشك ان يواقعه.

واته: حه‌ڵاڵ ئاشكرایه و حه‌رامیش ئاشكرایه وه له‌نێوانیاندا هه‌ندێك گومان لێكراو هه‌ن كه‌زۆرێك له‌خه‌ڵكی نایانزانن هه‌ركه‌سێك خۆی بپارێزێت لێیان ئه‌وا ئابڕو و دینی پاراستووه وه‌هه‌ركه‌س بكه‌وێته ناو گومان لێكراوه‌كانه‌وه بیانكات یان بیانخوات ئه‌وا كه‌وتۆته ناو قه‌ده‌غه‌كراوه‌كانه‌وه وه‌كو شوانێك وایه كه‌مێگه‌له‌كه‌ی له‌چواره‌دووری پاوانێكدا بله‌وه‌ڕێنێت گومانی ئه‌وه‌ی لێده‌كرێت كه‌سنووربه‌زێنی بكه‌ن. بێگومان هه‌موو پاشایه‌ك سنورێك و پاوانێكی خۆی هه‌یه سنوور و پاوانی خواش قه‌ده‌غه‌كراوه‌كانیه‌تی.

بـەڵێ لەقورئانـدا ڕێگەپێـدراوەکان و ڕێگەپێنـەدراوەکان واتـە ( حـەڵاڵ وحەرام) ئاشکراو دیارن، بەڵام ئەوشتانەی گومانیان لێدەکرێت پێویسـتە بـەپێی فەرموودەکە مامەڵیان لـەگەڵدا بکرێت لـەترسی ئەوەی نەبادا مرۆڤـی مسـوڵمان بکەوێتە ناو قەدەغەکراوەکانـەوە هەرکەسـێك وایکـرد خـوای گـەورە دەیخاتـە بەهەشتەوەو ڕێگەی پێدەدات تکـا بـۆ( ١٠ ) لـەکەسـوکاری بکـات، شـەفاعەت وتکاکردن لـەقورئان و سووننەتدا چەسپاوە، ئەوکەسەی قورئان بخوێنێت وکاری پێبکات فەرمانـەکانی بـەجێ بهێنێـت و قەدەغـەکراوەکانی وازلێ بهێنێـت ئـەوە دەتوانێت شەفاعەت و تکا بۆکەسانی تـر بکـات بـەهۆی ڕێـزو پلەوپایـەی لای خوای گەورە وە یەکەم کەسانێك کەتکایان بۆدەکات دایك و باوکیەتی، چونکە ئەوان هۆکاری سەرەکی ئەوکارەبوون ئەگەر چی خۆیان قورئان خوێن نەبووبن، بێگومان ئەو شەفاعەت و تکا کردنەش دوای ڕێگە پێدانی خوای گەورە دەبێـت بۆ کەسێ کە خۆی بیەوێ وەلـەکەسێ کە خۆی بیەوێ وە شەفاعەت بۆ کەسـێ نیـە کە باوەڕی بەخوا و پێغەمبەر نەبێ شەفاعەت کردنی منداڵ بۆ دایك و بـاوك یان بە پێچەوانەوە لـە قورئانی پیرۆزدا چەسپاوە هەروەك خوای گەورە دەفەرموێ سەبارەت بە دوعا کردنی منداڵ بۆ دایك و بـاوك ﴿رَبِّ اجْعَلْنِـي مُقِـيمَ الصَّـلاَةِ وَمِن ذُرِّيَّتِي رَبَّنَا وَتَقَبَّلْ دُعَاءِ﴾(ابراهيم/٤٠) واتە: پەروەردگارا لـەخۆم و دایـك و باوکم و ئیمانداران خۆشببە لەوڕۆژەدا کەلێپرسینەوە بەرپادەبێت وە دەربـارەی نزای باوك بۆمنداڵەکانی دەفەرموێت﴿رَبِّ اجْعَلْنِي مُقِيمَ الصَّـلاَةِ وَمِـن ذُرِّيَّتِـي رَبَّنَا وَتَقَبَّـلْ دُعَـاءِ﴾ (ابراهيم/٤٠) واتـە: پـەروەردگارا خـۆم و نـەوەکانم بگێـڕە لـەوکەسانەی کەئەنجامدەری نوێژبین بەچاکی، پەروەردگارا دوعا و نزام گیرابکە.

شـەفاعەت و تکـا مـافی پێغەمبـەران و نێردراوەکـان و قورئـان و ڕۆژو و کـردەوە چـاکەکان و بەنـدەی چـاك و ئـەولیائی بەتـەقوا لەخواترسـە.

لەفەرموود، کە زیادەیەکی تیادایە لەشەفاعەت وتکای کەسێك بۆدایك و باوکی پاش ئەوان، بۆخزمانی تر کەشایستەی چوونە دۆزەخ بوون، ئەوەش فەزڵ وڕێزی خوایە دەیدات بەکەسێك کەخۆی بیەوێت لەپاداشتی خوێندنی قورئان و بەهەندگرتنی و کارپێکردنی لەژیانی دونیادا. پاداشتی چاك لای خوایە.

هەروەك پیاوچاك تکادەکەن بۆدایك و باوکیان و خزمە نزیکەکانیان، هەروەها شەفاعەت بۆ ئەوانە دەکەن کەفێرخواز بوون یان مامۆستایان بوون، یان کەسێك کەخۆشی ویستوون یان خۆشیان ویستوون لەبەرخوا.

٣١- عن ابي شريح الخزاعي قال: قال رسول الله(ﷺ): ان هذا القرآن سبب طرفه بيد الله وطرفه بايدكم فتمسكوا به فانكم لن تضلوا ولن تهلكوا بعده ابداً. ( اخرجه ابن ابي شيبة)

واتە: بێگومان ئەو قورئانە هۆکارێکە، لایەکی بەدەستی خواوەیە، لایەکەی تری بەدەستی ئێوەیە، دەستی پێوەبگرن هەرگیز گومڕا نابن وپاش ئەوە هەرگیز تیاناچن.

خوای گەورە قورئانی دابەزاندووە بۆ ڕێنومایی مرۆڤەکان، قورئان وتەی خوایە فەرموویەتی وبەردەوام دەیفەرموێت، لایەکی بەدەستی خواوەیە لایەکەی تری کەبریتییە لە( مصحف) پەڕاوی قورئان لەناو دەستی ئێمەدایە، گوریسی پتەوی خواییە لە نێوان ئێمە وخوادایە. هیچ شتێکی خراپ ونابەجێی تیادانییە خوای گەورە پاراستوویەتی لەهەموو لادان وگۆڕانێك﴿ انا نحن نزلنا الذكر وانا له لحافظون﴾ واتە: بەڕاستی هەرئێمە قورئانمان دابەزاندووە وهەرئێمەش پارێزگاری لێدەکەین.

ئەگەر گرفتەکان زۆر بوون و ڕێچکەکان تێکەڵ بەیەکتر بوون وخەڵکی بوون بەکۆمەڵی جیاجیا، کێ زیاتر دەست بەقورئانەوە دەگرێت ئەوە سەربەرز وسەرفرازە.

٣٢- عن ابي هريرة(ﷺ) ان رسول الله( ﷺ) قال: ان هذا القران على خمسة اوجه، حلال وحرام ومحكم ومتشابه وأمثال، فاعملوا بالحلال واجتنبوا الحرام واتبعوا المحكم وامنوا بالمتشابه واعتبروا بالامثال. ( رواه البيهقي)

واتە: ئەم قورئانە لەسەر پێنج ڕوو دەدوێت: حەلاڵ وحەرام و مەحکەم( واتە دەلالەتەکەی ڕۆشن وڕوونە) و لێکچوو، چەند بۆچوونێك هەڵدەگرێت و پەند و چیرۆکە. کار بەحەلاڵ و ڕێگەپێدراوەکان بکەن دوور بکەونەوە لەحەرام وقەدەغە کراوەکان، شوێن مەحکەمەکان بکەون و باوەڕ بە( متشابه) بهێنن و پەند لەچیرۆك و بەسەرهاتەکان وەربگرن.

حەلاڵ و ڕێگەپێدراوەکان لەقورئاندا دیار و ئاشکران خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَآئِثَ﴾ (الاعراف/ ١٥٧) واتە: چاك و پاك و باشەکانیان بۆ حەلاڵ دەکات و پیس و خراپەکانیان لەسەر قەدەغە و حەرام دەکات. ﴿أُحِلَّ لَكُمْ لَيْلَةَ الصِّيَامِ الرَّفَثُ إِلَى نِسَآئِكُمْ﴾ (البقرة/١٨٧) واتە: شەوانی ڕەمەزان و ڕۆژووگرتن ڕێگەتان پێدراوە بچنەلای خێزانەکانتان.

وە قەدەغەکراوەکان ئاشکران کەشتەپیس وئاکار وشتەپیس وناشیرینەکانن. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاجْتَنِبُوا الرِّجْسَ مِنَ الْأَوْثَانِ وَاجْتَنِبُوا قَوْلَ الزُّورِ﴾ (الحج/ ٣٠) واتە: دووربکەونەوە لەپیسی بتەکان و لەووتەی درۆو هەڵبەستراو. لەئایەتێکی تردا دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالْدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنْزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلاَّ مَا

ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُواْ﴾ (المائدة/ ٣) واته: لەسەرتان قەدەغە كراوە گۆشتی مردارەوە بوو، خوێن وگۆشتی بەراز وئەوەی بۆجگە لەخوا كراوە( قوربانی) و خنكێنراوو ئەوەش بەئازارو لێدان مرداربۆتەوە، ئەوانەش كەدرندە پەلاماری دابن و لێی خواردبن مەگەر فریای چەقۆ كەوتبن. وەگۆشتی ئەو ئاژەلانەش كەلەو شوێنانەدا سەردەبڕێن كەهاناو هاواری بۆ غەیری خوا تیادادەبرێت. وەلەسەرتان حەرام وقەدەغە كراوە كەداوای چارەنووستان بكەن بەهۆی( ازلام) ەوە وەكو ئەو شتانەی لەرێگەی هەلدانی زارو فالگرتنەوەو بورجەكان و قاوەگرتنەوە..... هتد.

( محكم) بریتییە لەوەی حوكمەكەی چەسپاوەو بنەمایەكی یاسایی جێگیرو چەسپاو دەدات وەكو﴿يُوصِيكُمُ اللّهُ فِي أَوْلاَدِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الأُنثَيَيْنِ﴾ (النساء/ ١١) واته: خوا ڕێنومایتان دەكات و فەرمانتان پێدەكات دەربارەی نەوەكانتان لەبواری میراتگرتندا بۆهەر نێرینەیەك بەشی دوو مێینە هەیە. وەدەفەرموێت:﴿ وَالسَّارِقُ وَالسَّارِقَةُ فَاقْطَعُواْ أَيْدِيَهُمَا جزاء بما كَسَبَا﴾ (المائدة/ ٣٨) واته: پیاوی دزو ئافرەتی دز دەستیان ببڕن لەتۆلەی كاری ناڕەوایاندا كەدزییە.ئەو دوو ئایەتە نموونەی ئەو ئایەتانەن كەبە مەحكەم ناودەبرێن وفەرمودەكە دەفەرموێت شوێنی بكەون و جێ بەجێی بكەن.

( متشابه) بریتییە لەو ئایەتانەی كەماناكەی بۆ زۆرێك لە خەلكی زۆر ڕۆشن نییە وەكو ئەو پیتانەی كەلەسەرەتای هەندێك لەسورەتەكاندا هاتووە بۆنموونە(( الم، ص، المص، ...... هتد)) یان هاوشێوەی ئەوانە وردتر وەكو﴿الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَى﴾ (طه/ ٥) واته: خوای میهرەبان بەسەر تەختی فەرمانڕەوایی خۆیەوە وەستاوە. وەستان ڕۆشنە، بەلام دەربارەی وەستانی خوا لەسەر عەرش نازانین و ناتوانین بە هیچ بارێكدا بیچوێنین. لەبەرئەوە

پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمانمان پێده‌دات که‌بیر له‌دروستکراوه‌کانی خوا بکه‌ینه‌وه نه‌ك له‌زاتی خوا، چونکه ناتوانین مافی خۆی بده‌ینێ.

سه‌ره‌ڕای ئه‌وه‌ی که‌زۆرێك له‌و ئایه‌تانه‌ی که‌موته‌شابیهن بۆئه‌وانه‌ی که‌قوڵبوونه‌ته‌وه له‌زانست و زانیاریدا یان له‌کاتێکدا ناڕۆشنن، به‌ڵام له‌کات و ساتی تردا ڕۆشن ده‌بنه‌وه و ده‌بنه مه‌حکه‌م پێویسته مرۆڤی باوه‌ڕدار باوه‌ڕی پێیان هه‌بێت و بێ زانست ده‌م له‌ماناکه‌یان نه‌کوتێت.

نموونه‌کانی ناو قورئان زۆرن و بۆپه‌ند وه‌رگرتنه له‌ڕووداو و به‌سه‌رهاتی نه‌ته‌وه‌کانی پێش خۆمان، پێویسته سوودیان لێوه‌ربگرین و ئیجابیاته‌کان له‌ژیانی ڕۆژانه‌دا جێ به‌جێ بکه‌ین و له سلبیاته‌کان خۆمان بپارێزین. هه‌ندێك له‌وئایه‌تانه له‌شتی زۆر ووردو هه‌ستیار دوواون وه‌کوئایه‌تی﴿مَّثَلُ الَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَالَهُمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنبُلَةٍ مِّئَةُ حَبَّةٍ وَاللَّهُ يُضَاعِفُ لِمَن يَشَاءُ﴾ (البقرة/ ٢٦١) واته: نموونه‌ی ئه‌وانه‌ی له‌پێناوی خوادا ماڵ و سامانیان ده‌به‌خشن وه‌کو نموونه‌ی تۆوێك وایه که‌بڕوێت و حه‌وت گوڵی گرتبێت له‌هه‌ر گوڵێکدا سه‌د ده‌نکی تێدابێت، خواش بۆ هه‌رکه‌س بیه‌وێت پاداشتی چه‌ندباره ده‌کاته‌وه.

بێگومان خوای گه‌وره چاکه‌کان چه‌ند به‌رامبه‌ر ده‌کات، هه‌رچاکه‌یه‌ك به‌( ١٠ ) چاکه تا( ٧٠٠) چاکه به‌رامبه‌ر وزیاد ده‌کات وه‌کو ئه‌و ده‌نکه گه‌نمه‌ی ده‌ڕوێت وحه‌وت گوڵه‌گه‌نم ده‌ڕوێت و له‌هه‌ر گوڵێکدا( ١٠٠ ) ده‌نکه گه‌نمی تێدابێت. ئه‌وه به‌ڕاستی په‌ند و ئامۆژگاری گه‌وره‌ی تێدایه.

**٣٣**– سئل عبدالله بن ابي اوفى: اوصى النَّبي(ﷺ) قال: لا. قلت كيف كتب على الناس الوصية امروا بها ولم يوصي؟ قال: اوصى بكتاب الله عز وجل.
( رواه الجماعة الا ابوداود)

واتە: پرسیار لە عەبدوڵڵای کوڕی ئەبی ئەوفا کرا: ئایا پێغەمبەر وەسیەتی کردووە، ووتی: نەخێر، ووتم چۆن پێویستی کردووە لەسەر خەڵکی و خۆی نایکات؟! ووتی: وەسیەتی بەکتابەکەی خوا کرد کە قورئانە.

بێگومان وەسیەتی پێغەمبەر بۆ ئومەتەکەی کەشوێن قورئان بکەون لەدوای خۆی، باشترین وەسیەتە، چونکە قورئان وەسیەت و ئامۆژگاری خوا و پێغەمبەری تیادا کۆبۆتەوە. هەروەك خوای گەورە دەفەرموویێت:﴿ أَوَلَمْ يَكْفِهِمْ أَنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ يُتْلَى عَلَيْهِمْ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَرَحْمَةً وَذِكْرَى لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ﴾ (العنكبوت/ ٥١) واتە: ئایا بەس نییە بۆیان ئێمە قورئانمان دابەزاندووە بۆت وبەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، بێگومان ئالەو قورئانەدا ڕەحمەت ویادەوەری ئاشکرا هەیە بۆ ئەوکەسانەی ئیمان دەهێنن.

وەسیەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بریتییە لە فەرموودە وسوننەتەکانی کەهاوەڵە بەڕێزەکانی( ﷺ) بۆ ئێمەیان گواستۆتەوە. سەبارەت بەوەی کەهاوەڵە بەڕێزەکە پرسیاری دەربارەی نووسینی وەسیەت کرد، ئەوەیە کەخوای گەورە دەفەرموویێت:﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْراً الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالأَقْرَبِينَ﴾(البقرة/ ١٨٠) واتە: پێویست کراوە لەسەرتان کاتێك یەکێکیان نزیکی مەرگ بووەوە و ماڵ و سامان و داراییەکی هەبوو باوەسیەت بکات کەهەندێکی بدرێت بەدایك و باوکی و خزمانی بەشێوەیەکی باش و جوان.

پێغەمبەری سەرداریش(ﷺ) فەرمان دەدات ئەگەر کەسێك فەرزێك یان مافی کەسێکی لابوو کەپێویست بوو وەسیەتی بۆبکات باوەسیەتنامەیەك بنووسێت و دوای نەخات، چونکە مردن کتوپڕ دێت وەزۆر نزیکە لەهەموو کەسێکەوە.

**٣٤– عن جابر بن عبدالله(رضي الله عنه) قـال: خطبنـا رسـول الله( ﷺ) فحمـد الله واثنى عليه بما هو اهله ثم قال:(( اما بعـد فـان أصـدق الحـديث كتـاب الله وان افضل الهدي هدي محمد وشر الامور محدثاتها وكل بدعة ضلالة)) ثم يرفع صـوته وتحمر وجنتاه ويشتد غضبه اذا ذكر الساعة كأنـه منـذر جـيش قـال ثـم يقـول: (( اتتكم السـاعة. بعثت انا والساعة هكذا– واشار باصبعيه السـبابة والوسـطى– صبحتكم الساعة ومستكم. من ترك مالا فلاهله ومن تـرك دينـاً او ضـياعاً فـاليَّ وعليَّ)) ( رواه الامام احمد) .**

**واتە: لەجابری کوڕی عەبدوڵڵاوە وتوویەتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتـاری بۆداین، سوپاس و ستایشی زۆری خوای کرد کەشایستەیەتی پاشـان فـەرمووی: ڕاسـترین ووتـە پەرتووکەکـەی خوایـە، باشـترین ڕێنومـایی ڕێنومـایی موحەمەدە(ﷺ)، خراپترینـی کارەکـان داهێنراوەکـانن (بدعـە)ن لـەئاینـدا، وە هەموو داهێنراوێك لـەو جۆرە گومڕاییەیە. دواتر دەنگی بەرز کردەوە چاوەکانی سوور هەڵگەڕان و توڕەییەکەی زیادی کرد کەباسی ڕۆژی دوایی کـرد وەکـو ئـەوەی ڕایبگەیـەنێت کەسـوپایەك لـەهێرشـدایە بۆسـەرمان. پاشـان فـەرمووی: قیامەت هاتە لاتان، من نێردراوم و لـەگەڵ قیامەتدا ئـاواین، ئامـاژەی بەهـەردوو پەنجەی ناوەڕاسـت و شـایەتوومانی کـرد. قیامـەت بـەیانی و ئێـوارە دێتـەلاتان هەرکەس ماڵ و سامانێکی بەجێ هێشت بۆ خزمانی، وەهەرکـەس قـەرزێك یـان ونکراوێکی جێهێشت بۆمن و لەسەرمن.**

**لـە بنچـینە سـەرەکییەکانی بـاوەڕ بریتییـە لـە بـاوەڕ بەکتێبەکـەی خـوا، کەڕاسـترین و دروسـترین کەلامـە. هەرکـەس گومـانی لـەوەدا هـەبێت یـان بەرنامەیەکی تر وپەرتووکێکی تر هەڵبگرێت و باوەڕی وابێت لـەقورئان پیرۆزترو بەرێزترە ئەوە بێ باوەڕە بەقورئان و لـەڕیزی مسوڵمانان دەچێتە دەرەوە.**

( بدعة) بریتییه لەهەر داهێنراوێك كەدژایەتی قورئان و سوننەت یان یەكێك لەبنەما سەرەكییەكانیان بكات. ئاینی پیرۆزی ئیسلام هاتووه بۆ بەرژەوەندی مرۆڤ یەكێك لەمقاصیدی شەریعەت بریتییه لە( حفظ النفس) كاتێك جگەرەكێشان داهێنراوه و زیان بەتەندرووستی مرۆڤ دەگەیەنێت ئەوە بیدعەیەكی خراپه و دەدرێتەوە بەرووی ئەوكەسەی دایهێناوه و ئیسلام قەدەغەی دەكات چەندین نموونەی تر هەیە كەخوێنەری بەرێز خۆی دەتوانێت وردبێتەوە. وەنموونەی( سنة الحسنة) بریتییه لە بەكارهێنانی بلندگۆ بۆ بانگدان، بلندگۆ لەسەردەمی پێغەمبەردا نەبووە، بەلام داهێنانی كارێكی باش و ئیجابییە. پێوەر بۆ جیاكردنەوەی بیدعەی چاك لە خراپ ئەوەی كە هەركار و گوفتارێك بووە مایەی خراپەكاری ودووبەرەكی و نائارامی ئەوە بەبیدعەیەكی خراپ دادەنرێت، پێچەوانەكەی باشە.

**٣٥**- عن علي بن أبي طالب(رضي الله عنه) قال سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: الا انها ستكون فتنة، فقلت ما المخرج منها يارسول الله(ﷺ) قال: كتاب الله فيه نبأ ماقبلكم وخبر مابعدكم وحكم مابينكم هو الفصل ليس بالهزل، من تركه من جبار قصمه الله ومن ابتغى الهدى في غيره اضله الله وهو حبل الله المتين وهو الذكر الحكيم وهو الصراط المستقيم هو الذي لاتزيغ به الاهواء ولا تلتبس به الا لسنة ولايشبع منه العلماء ولايخلق على كثرة الرد ولاتنقضي عجائبه. هو الذي لم تنته الجن إذا سمعته حتى قالوا إنا سمعنا قرآناً عجباً يهدي الى الرشد. من قال به ومن عمل به أُجر و من حكم به عدل و من دعا اليه هدى الى صراط مستقيم)

واتە: لە عەلی كوڕی ئەبی طالیبەوە دەڵێ گوێم لە پێغەمبەر بوو فەرمووی: ئاگادار بن فیتنەو ئاژاوەیەك بەرپا دەبێت، وتم: چۆن لێی دەرباز ببین ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی كتێبەكەی خوا هەواڵی پێش ئێوەو دوای ئێوە و

فەرمان ڕەوای نێوانتانی تێدایە، واتە: قورئـان جیـا کەرەوەیـە گاڵتـەجاڕی نییـە هەرکەسێ وازی لێ بێنێ لـە زۆرداری دا خـوا پشـتی دەشـکێنێ وەهەرکەسـێ ڕێنمایی لە غەیری قورئانەوە وەربگرێ گومڕا دەبـێ. وە قورئـان پـەتی خـوایی پتـەوە، وە یـاد و زیکرێکـی خـوای پـەروەردگارە وە ئـەوە ڕێبـازی ڕاسـت و دروستە، وە هەر ئەوە ئارەزووەکان بەرەو چاکی ئاراستە دەکات و لایان نادات وە زمانەکانی لێیان تێکەڵ نابێ وە زانایـان لێـی تێـر نـابن وە لـە زۆر دوبـارە خوێندنەوە و کردنەوەی بێزاری دروست نابێ وە بابەتە ناوازەکانیان کۆتای یان نایەت، وەهەر قورئانەکە جن واتە(پەریەکان) کاتێ بیسـتیان هیچـیان بـۆ نـەکرا جگە لەوەی کە وتیان ئێمە قورئانێکمان گوێ لێ بـووە ڕێنمـای ئـەکا بـۆ ڕێـی ڕاست. هەرکەسێ بە قورئان قسە بکات ڕاست دەکات وە هەرکەس کاری پـێ بکات پاداشت دەدرێتەوە، وەهەرکەس فەرمان ڕەوای پێبکات دادپەروەر دەبێت وەهەرکەس بانگەوازی بۆ بکات یان بۆی بـانگ بکرێـت ئـەوە بـەرەو ڕێگـەی ڕاست هەنگاوی ناوە یان بانگ دەکات.

ئەم فەرموودەیە گشتگیرە بۆ سیفەتەکانی قورئانی پیرۆز، فەرموودەیەکی زۆر گەورەیە پێویستە قوڵ بینەوە تیایدا وەڵامی شیفا بەخشە بـۆ دەرچـوون و ڕزگـار بـوون لـە فیتنـەو ئاژاوەکـان لەهـەرکات و شـوێنێکدا بـەرپابێت کـە بریتییـە لەگەڕانەوە بۆ لای قورئانەکەی خوای گەورە، چونکە لە قورئانی پیرۆزدا:

❁ هەواڵ و بەسەرهاتی نەتەوەکانی پێش ئێمـەی تێدایـە، وەئـەوەی ڕۆشـن کردۆتەوە کەئەوانەی شوێن ڕێبازی خوای گەورە کەوتن سەرفرازو ئاسودە بون و بەڵام ئەوانەی پشتیان تێ کرد بەدبەخت و زیان مەند بوون.

❀ هەروەها هەواڵی پاش خۆمانی تێدایە لە هەواڵەکانی ڕۆژی دوایی هاتنی :ابەزینەوەی عیسای کوڕی مەریەم (عليه السلام) وەجگە لەوانە چەندین زانیاری تـر کە کەسانێك هەن زانان پێیان وەکەسانێکی تریش نەزانن پێیان.

❀ وەحوکمی نێوانمان کەبریتییە لەئەحکامەکانی قیصاص و تۆڵەسەندنەوە و باری کەسێتی و ئاڵ وگـۆڕی کـڕین و فرۆشـتن لـەنێوان تاکـەکان و کۆمەڵـدا لەبارەکانی هەرزانی و گرانی و خۆشی و ناخۆشی و ئاشـتی و جەنگـدا هـەموو ئەو باسانە لەقورئاندا هاتووە.

❀ قورئان بە(( فصل)) وەسف دەکرێت کەجیاکەرەوەیە لەنێوان ڕاسـتی و ناڕاستی ئەحکامەکانی قەتعین و بنەما ئوسوڵیەکانی سابت و جێگیر و ڕۆشنن.

❀ قورئان گاڵتـەجاڕی تیانییـە هـەمووی جدییـە و هـیچ ئایـەتێکی تیانییـە گاڵتەئامێزبێت. بابەت و باسەکانی حەڵاڵ یان حەرام یان موحکەم یان موتەشـابە یان بەسەرهات و ڕووداو و نموونەن.

❀ هەرکـەس پشـتی تـێ بکـات لەدەسـەڵاتداریدا بـەهۆی لووتبـەرزی و زۆرداریەوە خوا پشتی دەشکێنێت، قورئان فەرمان دەکـات بـە دادپـەروەری و چاکەکاری دادگەری بنچینەی مانەوەی دەسەڵات و بەردەوامییـەتی. هەرکـەس وازی لێهێنا لەدەسەڵاتداران خوا سزای دەدات و کەگرتی بەرینادات.

❀ هەرکـەس بیـەوێت ڕێنمـایی لەڕێگـە و ڕێبـاز و پـەیامێکی تـر دەسـت بکەوێت گومڕا و سەرلێ شێواو دەبێت، چونکە یاسـا و ڕێبازێـك نییـە کـەمرۆڤ دابینابێـت ڕێنمـایی و هیدایـەتی تێـدابێت. هەرکـەس سـەربەرزی دەوێـت لەقورئاندایە، هەرکەس لایدا خوا ڕسوای دنیا و دواڕۆژی دەکات.

❁ قورئان گوریس و پەتی پتەوی خوایە، لایەکی لەدەستی خوایە و لاکەی تری لەدەستی ئێمەدایە، هەرکەس دەستی پێوە بگرێت ئەوا دەستی گرتووە بەحەبلی پتەو و گوریسی ئەستور و بەهێزەوە کەهەرگیز نابچڕێت.

❁ قورئان زیکر و یادی خوایە. هەرکەس بیەوێت لەیادی خوادا بژی باشترین زیکر ویادی خوا لەقورئاندایە. قورئان ڕێبازی ڕاست و دروستە، هەرکەس لەسەری بڕوات لەوانە نابێت کەغەزەب لێگیراو و گومڕان.

❁ هەوا و ئارەزووەکان ناتوانن لەمانای ڕاستەقینەی خۆی لایدەن هەرکەس هەوا و ئارەزووی خۆی بەکاربهێنێت لەتەفسیر و لێکدانەوەیدا زۆری پێناچێت کەخوا فێڵەکەی ئاشکرا دەکات و ڕسوا دەبێت، چونکە خوا پەیمانی پاراستنی داوە﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ﴾ (الحجر/ ٩) .

❁ قورئان بەزمانێکی پاراو هاتۆتە خوارەوە، کەس ناتوانێت پیتێکی لێ زیاد یان کەم بکات.

❁ زانایان هەرگیز لێی تێر نابن، چونکە چاوگ و سەرچاوەی هەموو زانستە شەرعییەکان و بوارەکانی تری ژیانە.

❁ لە زۆر دووبارەکردنەوەی بێزاری دروست نابێت، هەرچەندە خوێندنەوەی دووبارە بکرێتەوە جار لەدوای جار چێژی زیاتر دەبەخشێت و مانای تازە و چەمك و تێگەیشتنی نوێ دەدات.

❁ نهێنی و عەجائیبەکانی کۆتاییان نایەت، ئەوەی لەدوای کۆچی پێغەمبەر(ﷺ) دەرکەوتووە زۆر زیاترە لەوەی لەژیانیدا دەرکەوتبوو، وەئەوەش کە لە داهاتوودا دەردەکەوێت زۆر زیاترە لەوەی لەمەوپێش.

❁ کاتێك جن گوێیان لەقورئانی پیرۆز بوو، هیچیان بۆ نەمایەوە جگە لە تەسلیم بوون و موسوڵمان بوون، بێگومان قورئانی پیرۆز بۆ هەموو مرۆڤایەتی

وجیهانی(جن) پەریش هاتووە. کاتێك قورئانێك ڕێنموی وهیدایەت بێت بۆجن، زیاتر و لەپێشتر هیدایەتە بۆمرۆڤ.

❁ هەرکەس بەقورئان قسە بکات ڕاستبێژە و ڕاستگۆیە، چونکە قورئان جگە لەڕاستی هیچی تری تێدانییە.

❁ هەرکەس کاری پێبکات پاداشتی خۆی وەردەگرێت، کارپێکردنی و هەنگاونان لەژێر ڕۆشنایی ئایەتەکانی خوای گەورە پاداشتی چەندبارە دەکاتەوە، پاداشتی چاکەیەك بەدەیە و زیاترە.

❁ حوکم کردن و جێبەجێ کردنی عەدل و دادپەروەری فەراهەم دێنێت جائەو فەرمانڕەوایەتییە لەگەڵ خۆی بێت یان خێزانی یان کۆمەڵگای یان وەکو فەرمانڕەوایەك.

❁ هەرکەس بانگەوازی بۆ بکات ڕێگای ڕاستی گرتۆتەبەر قورئان چرا ورۆشنایی بانگخوازانە و ڕێگای ڕاست و دروستی خواناسانە.

بەڕاستی و بێگومان فەرموودەکە وردترین و گشتگیرترین و جوانترین وەسفی قورئانی کردووە، چونکە پێغەمبەری سەروەر(ﷺ) (( جوامع الکلم))ی لایەو لەهەوا وئارەزووەوە قسە ناکات بەڵکو وەحی و نیگای خوایی بۆهاتووە.

**٣٦**– عن أبي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: أن رسول الله( ﷺ) عام تبوك خطب الناس مسند ظهره الى نخلة فقال: (( ألا اخبركم بخير الناس وشر الناس؟ ان خير الناس رجل عمل في سبيل الله على ظهر فرسه أو على ظهر بعيره او على قدمه حتى يأتيه الموت وأن من شر الناس رجلاً فاجراً يقرأ كتاب الله لا يرعوي الى شيء منه)) ( رواه احمد والنسائي والحاكم وصححه).

واتە: لە ئەبی سەعیدی خودریەوە(رضي الله عنه) وتی: پێغەمبەر(ﷺ) لەساڵی تەبوکدا پشتی دابوو بەدارخورمابەکەوە ووتاری دەدا فەرمووی: هەواڵی باشترین

کەس و خراپترین کەستان پێ ڕابگەیەنم؟ باشترین خەڵکی کەسێکە (پیاوێکە) لەپێناوی خوادا کاردەکات لەسەر پشتی ماینەکەی یان وشترەکەی یان لەسەر پێیەکانی خۆی تا مردن و دواهەناسەی ژیانی وەخراپترینی خەڵکی کەسێکە خراپەکارە، قورئانی پیرۆز دەخوێنێتەوە بەڵام ئاوڕ بۆ هیچی ناداتەوە.

کارکردن بۆ بەرزکردنەوەی ئاڵای پیرۆزی ئیسلام وشەی پیرۆزی( لااله الا الله محمد رسول الله) و بانگەوازکردن بۆ جێ بەجێ کردنی ئەحکامەکانی قورئان و ئاشناکردنی مرۆڤەکان بەجوانییەکانی ئیسلام لەبەرزترین وگەورەترینی کارەکانی مرۆڤە، ئەوەش بەردەوامی پێویستە. هەرکەس وابکات تادەگاتەوە بە خوای پەروەردگار باشترینی مرۆڤەکانە بەپێی فەرموودەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بەڵام ئەوکەسەی کەقورئان دەخوێنێت وکاری پێناکات و بەپێچەوانەی ئاراستەو ئامۆژگارییەکانی دەجوڵێتەوە ئەوە خراپترینی مرۆڤەکانە. خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿أَتَأْمُرُونَ النَّاسَ بِالْبِرِّ وَتَنسَوْنَ أَنفُسَكُمْ وَأَنتُمْ تَتْلُونَ الْكِتَابَ أَفَلاَ تَعْقِلُونَ﴾ (البقرة/٤٤) واتە: ئایا ئێوە فەرمان بەخەڵکی دەکەن بەچاکە و خۆتان لەبیر دەچێتەوە لەکاتێکدا ئێوە قورئان دەخوێنن ئەوە بۆچی ژیر و هۆشیار نابن.

هەندێك لەزانایان وتوویانە: ئەوکەسەی قورئان دەخوێنێت زۆرجار بەخۆی نازانێت نەفرین لەخۆی دەکات دەڵێت: ﴿أَلاَ لَعْنَةُ اللّهِ عَلَى الظَّالِمِينَ﴾( الهود/١٨) . واتە: بەڕاستی نەفرینی خوا لەستەمکارانە، لەهەمان کاتدا خۆی ستەم لەخۆی دەکات یان ستەم لەخەڵکی تر دەکات. ﴿لَّعْنَةَ اللّهِ عَلَى الْكَاذِبِينَ﴾ (ال عمران/ ٦١) ئاگاداربن بەڕاستی نەفرینی خوا لە درۆزنانە، خۆیشی یەکێکە لەوان. واتە خۆی درۆ دەکات.

ئەبو سلێمانی دارنی دەڵێت: ( زبانية) واتە ئەو فریشتانەی تاوانکاران بەرەو دۆزەخ دەبەن، خێراتر و کاراترن لەفڕێدانی هەڵگرانی قورئان و قورئانخوێنان کەسەرپێچی خوا دەکەن بۆ ناو ئاگر وەك لەفڕێدانی بتپەرستان بۆ ناو ئاگر.

هەندێك لەپێشینان وتوویانە: بەندە هەیە کەدەستدەکات بەخوێندنی سورەتێکی قورئان لەوکاتەوە فریشتەکان داوای ڕەحمەتی بۆدەکەن تا تەواو دەبێت. بەندەیەکی تر کەدەستدەکات بەخوێندنی سورەتێکی قورئان فریشتەکان لەوکاتەوە فریشتەکان نەفرینی لێدەکەن تاتەواو دەبێت. وتیان چۆن شتی وەها دەبێت؟! پێشینەکان وتیان: ئەگەر حەلاڵی حەلاڵ کرد و حەرامی حەرام کرد ئەوا فریشتەکان دروودی لەسەردەدەن، ئەگەر بەپێچەوانەوە بوو نەفرینی لێ دەکەن.

ئیبن ماجە فەرموودەیەکی جندب دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: ئێمە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) عیلم و ئیمانمان هێنا پێش قورئان کەسانێك پەیدادەبن قورئان هەڵدەگرن پێش ئیمان و باوەڕ، پیتەکانی وەردەگرن و سنورەکانی دەبەزێنن و مافی نادەنێ دەڵێن: قورئانمان خوێند کێ لەئێمە قورئان خوێن ترە، بوینە زانا کێ لەئێمە زاناترە. ئەوە حاڵیانە، ئەوانە خراپترینی ئەم نەتەوەن. قەتادە دەڵێت: ئەوەی قورئان دەخوێنێت یان پێی زیاد دەکات یان پێی کەم دەکات﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَاراً﴾( الاسراء/٨٢) واتە: ئێمە لەقورئان ئایەت و سورەتانێك دادەبەزێنین کەببێتە شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشییە دەروونی و جەستەییەکان، هەروەها ڕەحمەتیش بۆ باوەڕداران، بەلام بێباوەڕ و ستەمکاران هیچ زیاد ناکەن جگە لەخەسارەتمەندی.

٣٧- عن أبي سعيد الخدري(ﷺ) عن النَّبي( ﷺ) قال: يخرج فيكم قوم تحقرون صلاتكم مع صلاتهم وصيامكم مع صيامهم وعملكم مع عملهم ويقرأون القرآن لايجاوز حناجرهم. يمرقون من الدين كما يمرق السهم من الرمية ينظر في النصل فلا يرى شيئاً وينظر في القدح فلا يرى شيئاً وينظر في الريش فلا يرى شيئاً ويتمارى من الفوق. ( رواه الأربعة)

واته: لەناو ئێوەدا کۆمەڵ و کەسانێك پەیدادەبن، ئێوە نوێژەکانی خۆتان بەکەم دەزانن بە بەراوورد بەنوێژی ئەوان وە ڕۆژووەکانتان بە بەراوورد بەڕۆژووەکانیان، وەکار و کردەوەکانتان بە بەراوورد بەکار و کردەوەکانیان، ئەوانە قورئان دەخوێنن بەلام لە قورگیان ناچێتە خوار( واتە تەنها سەرزارەکی قورئان دەخوێنن و ئیمانیان پێی نییە) ئەوەیان لە ئاین قبوڵە کە بەحەز و ئارەزووەکانیان بخوات وەلەئاین دەردەچن بەخێرایی دەرچوونی تیر لەکەوان، سەیری تیر یان شمشێر دەکات هیچی تیانابینێت، سەیری پەرداخ دەکات یان کوپ ( لەوە دەچێت پێغەمبەر(ﷺ) مەبەستی ئەوانە بێت کەسەیری قاوە دەکەن یان قاوە دەگرنەوە) بەلام هیچی تیانابینن، لەبڵندیەوە دەمەدەمە و جەدەل دەکات.

موسلیم و ئەبوداود و نیسائی بەجۆرێکی تر ڕیوایەتی ئەو فەرموودەیەیان کردووە:(( يأتي في آخر الزمان قوم حدثاء الاسنان سفهاء الاحلام يقولون من خير قول البرية يمرقون من الاسلام كما يمرق السهم من الرمية لايجاوز ايمانهم حناجرهم فاين لقيتموهم فاقتلوهم، فان قتلتم اجر لمن قتلهم يوم القيامة)) ئەم فەرموودەیە ئاماژە بەترسناکی و زیانی ئەوکەسانە دەکات کەبەناوی ئاینەوە سیحر و جادوو دەکەن و فاڵچێتی دەکەن و دەستی خەڵکی دەبڕن، ئەوکارە بەجەریمە و تاوان دەدرێتە قەڵەم (لەیاسای سزادانی عیراقیشدا هاتووە ئەگەر

کەسێك ادعای ئەوە بکات کەدەتوانێت چارەسەری نەخۆشییەکانی خەڵك بکات بەناوی ئەوەی کەگوایە قسە لەگەڵ جن دەکات و ژووری تایبەتی بۆ داناوە بەلاّم لەژێرەوە کاری نابەجێ دەکات، ئەوە سزای تایبەتی بۆ دانراوە).

ئەم فەرموودەیە بەسەر ڕۆژهەلاّتناسەکانیشدا دەچەسپێ کەڕستە و نووسراوی هەنگویناوی دەدەن بەگوێی خەڵکیدا، بەلاّم مەبەستیان لێدانی ئاین و ناشرینکردنیەتی. هەروەها کەسانێك کەبیروباوەڕی گەندەڵ و خراپیان هێناوەتە ناو مسوڵمانان بەمەبەستی تێکدانی بیروباوەڕی مسوڵمانان بەتایبەتی لاوان. خۆیان وایپیشان دەدەن کەزانا و لێهاتوون و خاوەن فکر و ڕۆشنبیرین.

مەعازی کوڕی جەبەل دەفەرموێت: ئاژاوە و فیتنەیەك بەدواتانەوەیە کەماڵ و سامان تیایدا زۆر دەبێت، قورئان تیایدا دەکرێتەوە تا ئەو ڕادەیەی کەباوەڕدارو و دووڕوو( منافق) و ژن و پیاو گەورە و بچووك، کۆیلە و ئازاد وەریدەگرن و لەوانەیە یەکێ بڵێت: ئەوە چییە خەڵکی شوێنم ناکەون خۆمن قورئان دەخوێنم ئەوانە شوێنم ناکەون تا بیدعەیەك دانەهێنم جگە لە قورئان، وریابن لەو داهێنراوانە کەگومڕاییە. وە ئاگادارتان دەکەمەوە لەلادانی زانا و داناکان، چونکە جار هەیە شەیتان ووتەی گومڕایی لەسەر زاری حەکیمێك دەردەبڕێت وەهەندێك جاریش ووشەی ڕاستی لەدەمی دوو ڕوویەك دەردەچێت. وتیان ڕەحمەتت لێ بێت ئێمە بزانین لە سەر زاری حەکیم وحەق لە سەرزاری مونافیق ودووڕوو دەردەبڕێت؟ ووتی: بەڵێ، لەووتەکانی حەکیم ئەوانە وازلێبهێنە کە وەکو وڕێنە وایە و گاڵتەئامێز و ڕوخێنەر و دوور لەقورئانە، بەلاّم لەبیرت نەچێت هەرکات حەق درایەوە بەگوێیدا وەریدەگرێت، چونکە حەق و ڕاستی نور و ڕوناکی تایبەتی هەیە.

٣٨- عن عبدالله بن عمرو(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): أكثر منافقي هذه الامة قراؤها. ( رواه احمد والبيهقي وابن عدى وطبراني) واته: زۆرینەی دووڕووەکانی ئەم نەتەوەیە قورئانخوێنەکانیەتی.

خوای گەورە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ الْمُنَافِقِينَ فِي الدَّرْكِ الأَسْفَلِ مِنَ النَّارِ﴾ (النساء/١٤٥) واتە: دووڕووەکان لەچینی هەرە خوارەوەی دۆزەخن. نفاق ودووڕوویی بریتییە لەشاردنەوەی کوفر و بێباوەڕی و دەرخستنی ئیمان و باوەڕ. لەسەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) سەریهەڵدا. خوای گەورە ئایەتی ڕۆشنی لەوبارەیەوە دابەزاندووە دەربارەی سیفاتەکانیان دەفەرموویت:﴿ وَإِذَا قَامُواْ إِلَى الصَّلاَةِ قَامُواْ كُسَالَى يُرَآؤُونَ النَّاسَ وَلاَ يَذْكُرُونَ اللّهَ إِلاَّ قَلِيلاً﴾(النساء/١٤٢) واته: ئەگەر هەستان بۆ نوێژ بەتەمبەڵی هەڵدەستن، ڕیایی لای خەڵکی دەکەن، کەمێك نەبێت یادی خوا ناکەن. پێغەمبەر دەفەرموویت: (( اية المنافق ثلاث: اذا حدث كذب واذا وعد اخلف واذا اؤتمن خان)) (رواه البخاري ومسلم والترمذي والنسائي عن انس بن مالك) واته: نیشانەکانی دووڕوو سیانە: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، ئەگەر پەیمانیدا دەیشکێنێت، ئەگەر ئەمانەتی لادانرا خیانەتی لێدەکات. دووڕووەکان لێزان وزۆرزانن بەڵام بێباوەڕ و فێڵبازن. زۆرێك لەوانە قورئان دەخوێنن بەڵام گاڵتە بەئەحکامەکانی دەکەن چ بەکار یان بەگوفتار.

عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود وتوویەتی: قورئان دابەزیوە بۆ کارپێکردن بەڵام خوێندنی کراوە بەکار، یەکێ لەئێوە قورئان دەخوێنێت لە فاتحەوە تا کۆتایی پیتێکی لێ ناپەڕێنێت بەڵام هیچ کاری پێ ناکات.

عومەری کوڕی خەتاب دەفەرمووێت: ئەگەر زاناتان بینی حەزی لە دوونیـا بوو ئەوا گومان لـەدینەکەی بکەن، چونکە هەموو کەسێك بۆ خۆشەویسـتەکەی ملکەچ دەبێت.

حەسەنی بەسری وتوویەتی: سزای زانایـان مردنـی دڵیانـە، مردنـی دڵـیش داواکردنی دنیایە بەکاری ڕۆژی دوایی.

**٣٩**– قال( ﷺ): من قرأ القرآن عند ظالم ليرفع منه لعن بكل حرف عشـر لعنات. ( رواه البخاري في التاريخ الكبير بسند صالح).

واتە: هەرکەس قورئان بخوێنێت لای ستەمکارێك بۆ ئەوەی لە پلە و پایەی بەرز بکاتەوە یان ستەمێکی بۆ پەردەپۆش بکات بۆ هەموو پیتێـك دە نـەفرینی لێ دەکرێت.

سوفیانی سەوری وتوویـەتی: لەدۆزەخـدا دۆڵێکـی تایبـەت هەیـە بـۆ ئـەو قورئانخوێنانەی دەچنە دەرگـا و بارەگـای دەسـەڵاتداران و پاشـایان. حەزیفـەی یەمانی دەڵێت: ئاگاداربن ووریای هەڵوێستەکانی فیتنە و ئاژاوەبن. وتیـان ئـەوە چـییە؟ وتـی: دەرگـا و بارەگـای ئەمیرەکانـە، یـەکێك لــە ئێـوە دەچـێتە لای دەسەڵاتدار و ئەمیرێك، درۆکانی بەڕاست لە قەڵەم دەدات، وە هەندێك وەسفی دەکات کە وانییە.

مەکحولی دیمەشقی دەڵێت: هەرکەس قورئان فێرببێت و شارەزای ئاین ببێت پاشان هاوەڵێتی دەسەڵاتداری کرد وەکو تەمـەلوق و مـەرایی کـردن بـەهیوای دەستخستنی بەرژەوەندییەك لەلای، خۆی خستۆتە دەریایەك لــە ئـاگری دۆزەخ بە ئەندازەی هەنگاوەکانی. وە زانایانی سەردەمی ئێمە خراپترن لـەزانایانی بـەنی ئیسـرائیل، چـونکە ڕوخسـەت وڕێپێـدراوەکان و ئـەوەی لەگـەڵ حـەزی دەسـەڵاتدارانە باس دەکەن بۆیان. ئەگەر ئەرکەکانیان بیر بێنایەنەوە ئەوا لـەئاگر

رزگاریان دەکـردن. ئـەوا نەیاندەهێشـت بچـنە لایـان ئـەوەش دەبـووە مایـەی رزگاریان لای خوا.

فەزڵ وگەورەیی خوێندنەوەی قورئان وەهایە کەبەهەموو پیتێك دە چاکە بـۆ خاوەنەکـەی دەنووسـرێت. لەبەرامبەریشــدا هەرکــەس قورئـان بخوێنێـت بـۆ بەرزکردنەوەی شان و شکۆی دەســەڵاتدار و سـتەمکارێك بەهــەموو پیتێـك دە لەعنەتی لەسەرە. وەهەرکەس گاڵتـە بـەحورروماتی خـوا بکـات و سـنورەکانی بەزێنێت﴿إِنَّ الَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَا أَنزَلَ اللّهُ مِنَ الْكِتَـابِ وَيَشْـتَرُونَ بِـهِ ثَمَنـاً قَلِـيلاً أُولَـئِكَ مَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ إِلاَّ النَّارَ﴾ (البقرة/ ١٧٤) واتە: ئەوانەی نیگای خـوا دەشــارنەوە کــە لەکتێبەکانیــدا دایبەزانــدووە بــەو شــاردنەوەیە نرخێکــی کــە دەستدەخەن ئەوانە تەنها ئاگر دەخۆن. ئەبی دەرداء وتوویەتی: دەترسم لەلادانی زانایەك یان دەمەدەمی دووڕوویەك بەقورئان. قورئـان حەقـە و ڕاسـتییە، نـور و ڕوناکی لەگەڵدایە. هەرکەسێ بێ نیاز نەبێت لەدونیا ئەوا دونیای نیە.

# دەروازەی پێنجەم

## شێواز وئادابی خوێندنەوەی قورئان

خوای گەورە فەرموویەتی:﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ الْقُرْآنَ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾ (النمل/٩٨) واتە: ئەگەر قورئانت خوێندەوە پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی نەفرین لێکراو و ڕەجمکراو. هەروەها دەفەرمووێت:﴿ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً﴾ (المزمل/٤) واتە: دەوری قورئان بکەرەوە بەوردی و لەسەرخۆ. لەبەرئەوە پێویستە گرنگی بە چاك خوێندنەوە و شێوازی گونجاو و ئاوازی گونجاو وشایستە بدرێت لەدەور کردنەوە و خوێندنەوەی قورئانی پیرۆزدا. هەرکەس ڕێز دابنێت بۆدروشم و پەیامی خوا ئەوا نیشانەی پارێزگاری و لەخوا ترسانی دڵەکانە.

٤٠ – عن علي بن ابي طالب(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ) : ان افواهكم طرق القرآن فطيبوها بالسواك. ( رواه البزار بسند جيد) واتە: دەمتان ڕێگا و شوێنی دەربڕینی ئایەتەکانی قورئانە، پاك و بۆنخۆشی بکەن بەسیواك.

سیواك کردن پاککەرەوەی دەم و بەدەستهێنەری ڕەزامەندی خوایە. هەرکەس ڕێز لەقورئان بگرێت بە پاککردنەوەی دەمی ئەوا ڕێزی لە دروشم و پەیامی خوا گرتووە. لەبەرئەوە دەستنوێژ شۆرین بۆ خوێندنی قورئان کارێکی باش و سوننەتە. لەگەڵ ئەوەدا دەگێڕدرێتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەهەموو حاڵێکدا قورئانی خوێندووە مەگەر لەشی گران بووبێت. ئەوە بەڵگەی ئەوەیە کە دروستە قورئان بخوێنرێت بێ دەستنوێژ، بەڵام بە دەستنوێژەوە باشترە.

دەست لێدانی( مصحف) پەرتووکی قورئان بەدەستنوێژ و لەسەر پاکی جێ بەجێ کردنی وردی ئایەتی﴿لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا الْمُطَهَّرُونَ﴾ (الواقعة/٧٩) تەنها کەسانێکی بەدەستنوێژ دەست لەقورئانی پیرۆز دەدەن. ئەوە ڕای زۆرینەی زانایانی لەسەرە کە دروست نییە بێ دەستنوێژ دەست لەقورئان بدرێت.

لە سەعیدی کوڕی موسەیەبیان داواکرد فەرموودەی پێغەمبەریان بۆ باس بکات، شانی دادابوو ڕاست بوویەوەو وتی: حەزناکەم لەپاڵەوە باسی بکەم دیارە وتەی خوا کەقورئانە لەپێشترە کەبەڕێز و حورمەتەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. واباشە ڕوو بە قیبلە و بەشێوازێکی جوان ولەسەر چۆك دابنیشین. شێوازی خشوع و لەخوا ترسانت پێوە دیاربێت. ئیمامی مالکی کوڕی ئەنەس( ڕەحمەتی لێ بێت) خۆی بۆنخۆش دەکرد و جلی جوانی دەپۆشی کاتێك فەرموودەکانی پێغەمبەری(ﷺ) شی دەکردەوە. چ جای قورئان.

باشترین قورئان خوێندن لە نوێژدایە بە وردی و لەسەرخۆیی و بەگریانەوە لەقولایی شەودا و بەتەنها. خۆ ئەگەر بەدانیشتنانەوە یان بەلەپاڵەوە قورئان بخوێنیت دروستە، بەلام بەدانیشتنانەوە باشترە و خێرترە. خوا فەرموویەتی:﴿ الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَاماً وَقُعُوداً وَعَلَىَ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ﴾(ال عمران/١٩١) واتە: ئەوانەی یادی خوا دەکەنەوە بەپێوە، بەدانیشتن، وەلەپاڵەوە وەبیر لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی دەکەنەوە. لەپێغەمبەر(ﷺ) دەگێڕنەوە کەهەندێك ئایەت و سورەتی خوێندۆتەوە لەپاڵەوە پێش نووستن لەسەرجێگا.

بەوپێیەی کە پاککردنەوەی دەم بەسیواك پێش قورئان سونەتە و کارێکی باشە بەپێی فەرموودەکە ئەوا نەخواردنی سیر و پیازیش پێش قورئان خوێندن

کارێکی باشه. جگەرەکێشانیش کەبۆنێکی ناخۆش دروست دەکات، وازهێنان لێی پاراستنی تەندروستی و بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوایه.

فەرموودەکە ئاماژە بەگرنگیدان بەڕواڵەتی دەرەوە دەدات بەهەمانشێوەی ئەوە پێویستە گرنگی بدەین بەدیوی ناوەوە و دەروغان. خوای گەورە قورئانی بۆ کارپێکردن و جێبەجێ کردن دابەزاندووە. بەلاّم دەست پێکی ئەو کارپێکردنە بە خوێندنەوە دەبێت، هەرکەس باش قورئانی خوێندەوە و بەکارێکی گەورە و پیرۆزی زانی، ئەوە یەکەم هەنگاوی کارپێکردنی دەستپێ کردووە.

ئەگەر پاراستن و پاککردنەوەی دەم بەسیواك و لەبۆنی ناخۆشی سیر وپیاز ئەوا خۆبەدوورگرتنی قورئانخوێن لەدەمپیسی و جوێنفرۆشی و درۆ و غەیبەت و دووزمانی و بوختان و قسەبازی و لاقرتێ و قاقای زۆری پێکەنین و خۆهەڵقورتاندن لەشتێکدا کەپەیوەندیدار نەبێت بەوکەسەوە(( وهل یکب الناس في النار على مناخرهم یوم القیامة الا حصائد السنتهم)) ( گێڕانەوەی ترمزی وئیبن ماجه وحاکم وەبە صەحیحیان داناوە) واتە: ئایا شتێك هەیە خەڵکی فڕێداتە ناو ئاگر جگە لەبەرهەمی زمانیان.

لەپێشەوە شافیعیەوە دەگێڕنەوە لە(( قولی قدیمدا)) کەدروستە ئافرەتی حەیزدار لەترسی لەبیرچوونەوە قورئان بخوێنێت لەبەر.

٤١ – نعتت ام سلمة( ﵂) قراءة النّبي(ﷺ)فاذا هي تنعت قراءة مفسّرة حرفا حرفا. ( اخرجه ابوداؤد والنسائي والترمذي وقال حسن صحيح). واتە: ئوم سەلەمە دایکی باوەڕداران( ﵂) وەصفی قورئان خوێندنی پێغەمبەری دەکرد(ﷺ) که قورئان خوێندنەکەی تەفسی رئامێز بووە پیت پیت.

خوێندنەوەی تەفسیر ئامێز پیت پیت ئەوەیە کەهەموو پیتێك لەمەخرەجی (دەرەجەی) ڕاستی خۆیەوە دەربڕدرێت کەئەوەش بریتییە لەبنچینەی زانستی تەجوید. پێشەوا بەیهەقی ڕیوایەتی کردووە لە وتەیەکی ئیبن عومەردا( ﷺ) : هەرکەس قورئان بخوێنێتەوە بەڕۆشنی و دروستی و ئیعرابەوە بۆهەر پیتێك(٢٠) چاکەی بۆ دەنووسرێت (واتە یاساکانی تەجویدی جیٚ بەجیٚ کردبیٚ) وە ئەگەر وانەبێت بۆ هەر پیتێك( ١٠ ) چاکەی دەست دەکەوێت.

عەبدوڵڵای کوڕی عەباس(ﷺ) وتوویەتی: ئەگەر تەنها سورەتی( البقرة ـ ال عمران) بخوێنمەوە و هەڵوێستەی لەسەر بکەم و ماناکانی وەربگرم و باش لێی تێبگەم باشترە بەلامەوە لەوەی کەهەموو قورئان بە پەلەپروسکیٚ بخوێنمەوە.

پرسیار لەموجاهید کرا دەربارەی دووکەس کەنوێژ دەکەن وەهەردووکیان وەکویەك نوێژەکە تەواودەکەن، بەلاٚم یەکێکیان سورەتی بەقەرە تەواو دەکات و ئەوی تریان هەموو قورئان تەواودەکات، ئەویش لەوەلاٚمدا ووتی: هەردووکیان لەپاداشتدا وەکویەکن.

٤٢ – عن أنس بن مالك(ﷺ) انه سئل كيف كانت قراءة النبي( ﷺ) فقال: كانت مداً ثم قرأ بسم الله الرحمن الرحيم يمد بسم الله ويمد بالرحمن ويمد بالرحيم. (رواه البخاري وأبو داؤد). واتە: لەئەنەسی کوڕی مالیکەوە(ﷺ) پرسیاری لێکراوە کەقورئانخوێندنی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن بووە. ووتی: مەد بووە، پاشان( بسم الله الرحمن الرحيم)ی خوێندەوە( بسم الله)ی درێژ کردەوە، هەروەها( الرحمن) و( الرحيم)ی درێژ کردەوە.

پێویستە مسولّمان فێری بنەماکانی و ئەحکامەکانی و زانستی لەجوید و جوان خوێندنەوەی قورئان ببێت و لەقورئانخوێندندا بەکاری بهێنێت کەخشوع و لەخوا ترسانی پێوە دیاربێت و تەفاعول و کارلێکی پێوە دیاربێت بەشێوەیەك کەگوێگر بزانێت بەرێز و گەورە مامەڵە لەگەڵ کەلامی خوا دەکات.

جوان خوێندنەوە و تەرتیل جەخت دەکاتەوە لەگرنگیدان بەرووی دەرەوەی خوێندنەوەکە و ناوەرۆکەکەشی لە تەتبیق کردنی ئەحکامەکانی و ئیمان بوون لەدڵەوە، واتە پێویستە موسوڵمان لەرواڵەت و ناوەرۆکیدا پابەندبێت بەقورئانەوە، چونکە یەکێك لەسیفەتە بەرزەکانی خوا( الظاهر) ( الباطن) لەبەرئەوە پێویستە باوەڕدار خۆی برازێنێتەوە بەهەندێك لەرەوشتەکانی خوا، رواڵەت و ناوەڕۆکی پاك بکاتەوە.

٤٣ – عن عائشة(ﵺ) قالت: ابطأت على رسول الله(ﷺ) ليلة بعد العشاء، ثم جئت فقال: اين كنت؟ قلت كنت اسمع قراءة رجل من اصحابك لم اسمع مثل قراءته وصوته من احد. قالت فقام فقمت معه حتى استمع له ثم التفت اليّ فقال: ((هذا سالم مولى ابي حذيفة الحمد لله الذي جعل في امتي مثل هذا)). (رواه ابن ماجة باسناد جيد)

واتە: لەعائیشەوە(ﵺ) دایکی باوەڕداران فەرمووی: شەوێك دوای نوێژی عیشا لەپێغەمبەر(ﷺ) دواکەوتم ( کەمێك درەنگ چوومەلای) فەرمووی لەکوێ بوویت؟ ووتم: گوێم دەگرت لەقورئانخوێندنی پیاوێك لەهاوەڵانت، وێنەی خوێندنەوە و دەنگی واخۆشم لەکەس نەبیستووە. عائیشە فەرموی: پێغەمبەر(ﷺ) هەستا منیش لەگەڵیدا هەستام تا گوێی لێ بگرین، ئاوڕی بۆ

دامەوە و فەرمووی: ئەوە( سالم) ە کۆیلەی ئەبوو حوزەیفـە بـوو ئـازادی کـرد کەناسراوە بە( مولی أبو حذیفة) سوپاس بۆ ئـەو خوایـەی کـە لـە نەتەوەکەمـدا کەسی وای هەڵخستووە.

(سالم) یەکێکە لەگەورە هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) کەزاناو لەخواترسێکی زۆر گەورە بوو. عومەری کوڕی خەتتاب( ﷺ) کاتێك ویستی شەش کـەس دیـاری بکات بۆ دوای خۆی بۆ جێنشینی فەرمووی: ئەگەر سالم مەولای ئەبو حوزەیفـە زیندووبوایە دەمپالاوت بۆ جێنشینی دوای خۆم. خوای گەورە بەوشێوەیە لەشان و شەوکەتی کۆیلەکان بەرز دەکاتەوە بەهۆی خزمتکاری و ژیان لەگەڵ قورئاندا کەبپالێورێن بۆ جێنشینی و پێشەوایەتی و فـەرمانڕەوایی موسـوڵمانان، لەلایـەن کێ؟ عومەری کوڕی خەتتاب.

خوای گەورە دەفەرموویت﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾ (المجادلة/ ١١) واتە: خوای گەورە ئەوانە بەرز و شـکۆمەند دەکـات کـە باوەڕیان هێناوە و ئەوانەش زانا و تێگەیشتوون، بە پلەی زۆر. بەسە بۆ سالم کـە پێغەمبەر(ﷺ) تەزکیەی دەکات کەفەرمووی سـوپاس بـۆ ئـەو خوایـەی کەلـە ئوممەتەکەمدا کەسی ئاوای هەڵخستووە. هەروەها پێغەمبەر(ﷺ) گوێی دەگرت لەقورئان خوێنـدنی( أبـو موسـی الاشـعري) واوەسـفی دەکـرد کـە مزمارێـك لەمزامری ئال داودی هەیە بەهۆی خۆشی و شیرینی دەنگی.

عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ) پێی دەفەرموو: ئەبوموسا خوامان یادبخەرەوە، ئەویش دەستی دەکرد بەقورئان خوێندن تا نزیکـی ناوەنـد بـوونی کـاتی نوێـژ، دەیفەرموو: ئەی پێشەوای باوەڕداران، نوێژ، نوێژ. ئەویش دەیفەرموو: ئەی ئێمە

لەنوێژدانین؟! ئاماژە بەو ئایەتەی﴿وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ﴾(العنكبوت/٤٥) یادی خوا زۆر گەورەترە لەهەموو شتێك.

٤٤ – عن أبي هريرة(ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال: ليس منا من لم يتغنَّ بالقرآن)). (اخرجه البخاري)

واتە: لەئێمە نییە كەسێك بەئاواز ودەنگی خۆشەوە قورئان نەخوێنێت.

پێشەوا شافیعی دەفەرموێت: ( تغني) واتە: بەدەنگێكی پڕ لەدڵتەنگیو ئاوازی خۆشەوە بیلەرێنێتەوە. لە ئیبن وئەبی مولیكەیان پرسی: ئەگەر كەسێك دەنگی خۆش نەبێت؟ وتی: تابتوانێت باخۆشی بكات. واتە: ڕاهێنان بكات لەسەر جوان خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز.

لەهەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لەجوبەیری كوڕی موتعیم(ﷺ) وتویەتی: لەپێغەمبەرم بیستووە(ﷺ) كە لەنوێژی ئێوارەدا سورەتی(الطور)ی خوێند لەو دەنگخۆشتر و قورئان خوێنترم نەبینیوە، كاتێك بیستم ئەم ئایەتەی خوێند﴿أَمْ خُلِقُوا مِنْ غَيْرِ شَيْءٍ أَمْ هُمُ الْخَالِقُونَ﴾(الطور/٣٥) واتە: ئایا ئەوان بەبێ هیچ دروستبوون یان خۆیان دروستكەرن، خەریك بوو دڵم بفڕێت، جبیر لەوكاتەدا موشریك بوو لەسەر ئاینی هۆزەكەی بوو.

برای نووسەریش( د.محمد زكي) گوێی لە فەلەیەك بوو دەیوت: پێستم گرژدەبێت كاتێ گوێبیستی﴿إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ﴾ دەبم وەهەست دەكەم ئەوە بەرزترین شێوازی موناجات و پاڕانەوەیە لەبارەگای خوا.

یەکێك لەئادابەکانی خوێندنی قورئان(( ئیستیعازە)) یە، خوا دەفەرمووێت:﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ الشَّيْطَانِ نَزْغٌ فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ إِنَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾( الاعراف/٢٠٠) واته: ئەگەر قورئانت خوێندەوە پەنا بگرە بەخوا لەشەیتانی ڕەجمکراو. زانایان ڕایان جیاوازە لەسەر ئەوەی کامیان خێرترە، قورئان خوێندن بەنهێنی یان بەئاشکرا، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کەبەنهێنی خوێندن دوورترە لەڕیا و ڕوپامایی و زۆر لەخۆکردن و تەشویش خستنە سەرکەسانی تر. ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) چووە ناو هاوەڵانی لەمزگەوت نوێژیان دەکرد فەرمووی: (( ياايهاالناس كلكم يناجي ربه فلا يجهر بعضكم على بعض في القراءة)) واته:ئەی خەڵکینە هەمووتان هاوار لەخوای خۆتان دەکەن، هەندێکتان دەنگ بەسەر ئەوانی تردا بەرز نەکاتەوە و دەنگ هەڵنەبڕێت لەقورئان خوێندندا، بەڵام خوێندنیش بەدەنگی بەرز دڵی خوێنەر بێدار دەکاتەوە، بیر و هۆشی کۆ دەکاتەوە، گوێچکەی دەزرنگێتەوە، خەوی لێ دەتۆرێنێت، بەرەو بیرکردنەوە و تێڕامانی مانای ئایەتەکانی دەبات. وەکاریگەری دەبێت لەسەر بیسەرانی ئەگەر نیەت تەنها بۆ ڕەزامەندی خوابێت.

٤٥- عن فضالة بن عبيد(رضي الله عنه) عن النَّبي(ﷺ) قال: ((لله اشد اذناً الى قارىء القرآن من صاحب القينة الى قينته)). ( رواه ابن ماجة وابن حبان والحاكم وصححه) واته: خوای گەورە باشتر گوێگرە بۆ قورئانخوێن لەخاوەن کەنیزەکێکی گۆرانی بێژ بۆ گۆرانییەکانی.

هەرکەس ڕوو لەخوا بکات خوا ڕووی تێدەکات، وەهەرکەس بستێك بچێت بەرەو ڕووی خوا، خوا باڵێك دەچێت بەلایدا. هەرکەس بەڕۆیشتنی ئاسایی بچێت بۆلای خوا، خوای گەورە بەڕاکردن بەرەوڕووی دەچێت.

هەرکەس قورئان بەباشی و جـوانی و دەنگێکـی خـۆش و خشـوعەوە بخوێنێـت لەبەرخوا، وە بۆ نزیکبوونەوە لێی، خوای گەورە گوێی بۆ دەگرێت و شـانازی پێوە دەکات لای فریشتەکان. بەندەی باوەڕدار بەنزیکبوونەوەی لـە خوا سـوود بەخوا ناگەیەنێت( خوا)ش پێویستی پێی نییە و بێ نیازە. بەڵکو کار و کردەوەی چاك پێشکەش دەکات لـەبەرئەوە پاداشتەکەی ئەوەیە کەخوا لێی نزیك دەبێتەوە و گـوێی بۆدەگرێـت ژنـەفتی نزاکـانی دەبێـت و پلـەی لـەدونیا و دوارۆژ بەرزدەکاتەوە. ئەو گوێگرتنـە سـەرقاڵ و بێئاگـای ناکـات لـەنزا و پاڕانـەوە و پەرستشی بەندەکانی تر. وە توڕەبوونی لەسەرپێچی بەندەیەکی سەرقاڵی ناکـات لەخۆشحاڵبوونی بە تەوبەی بەندەیەکی.

کاتێك بەندە قورئان دەخوێنێت خوای گەورە گوێی بـۆ دەگرێـت( نمونـەی بەرز هەربۆخوایە) خوا باشـتر گـوێگرە بـۆ قورئانخوێنـدنی بەندەکـەی وەك لـە مۆسیقارێك بۆ ئـامێرە مۆسـیقیەکەی. گـوێگرتنی خـوا بۆبەندەکـەی جگـە لـە لێخۆشبوون و سڕینەوەی گوناهەکان و پلە بـەرز کردنـەوە و فـەڕ وبەرەکـەتی خوایی و ڕێنمایی کردن بۆ ڕێگەی ڕاست هیچی تر نییە.

٤٦ – عن حذيفة اليمان(ﷺ) عن النَّبي(ﷺ) قال: ((اقرأوا القرآن بلحون العرب واصواتها واياكم ولحون اهل الكتابين واهل الفسـق فانـه سـيجيء اقـوام يرجعون بالقرآن ترجيع الغناء والرهبانية لايجاوز حناجرهم مفتونة قلوبهم وقلوب من يعجبهم شأنهم)). ( اخرجه الطبراني والبيهقي).

واتە: قورئان بخوێنن بەئاوازی عەرەب و دەنگەکانی وریابن نەکەن بەئاوازی خاوەن دووکتێبەکە( أهل الكتاب) و خەڵکی فاسق و تاوانکاری قورئان بخوێنن.

کەسانێك پەیدادەبن و دێن قورئان دەگێڕنەوە و دەلاوێننــەوە وەکـو گـۆرانی و گۆشەگیری کە لـە قورگیان تێناپەڕێت، دڵیان توشی لادان و فیتنەبازی بووە، وە دڵی ئەوکەسانەش کەسەرسامی ئەوشێوازەیە.

لـە پێشەوا مالـك( ڕەحمەتی خوای لێبێـت) دەگێڕنـەوە کـەقورئان خوێنـدن بەئاوازێکەوە بـەلای ئـارەزوودا بێـت قەدەغەیـە. مـاوەردی لەپێشـەوا شـافیعی دەگێڕێتـەوە کەئەگـەر قورئـان خوێنـدن بەئاوازێکـەوە کەهەنـدێك لەپیتـەکان لەمەخرەجی دەرچوونیان لابدات قەدەغە و حەرامە.

لێرەوە مەبەست لـەخوێندنی قورئـان بـەئاوازەوە پێویسـتە بـەپێی بنـەماکانی ڕێزمانی عەرەبی بێت. ڕێگرتن لەخوێندن بـەئاوازە داهێنراوەکـان لـە جولـەکـە یان( فەلە) وەرگیرابێت یان ئـەوەی کەسـانی خـراپ و سـەما و خراپـەکاری و گـۆرانی بێـژە لادەرەکـان و ئـەو ئاوازانـەی کـە زیـاتر شـێوازی گـۆرانی لەخۆدەگرێت یان ئـەو ئاوازانـەش کەگۆشـەگیرن ئەوانـە هـەموویان حـەرام و قەدەغەکراون. هەرکەس گرنگی بەلاواندنەوە و خۆشکردن و جوانکاری بکات دوور لەبنچینە و بناغەی زانستی تەجویـد و ئـەوەی کـە مسـوڵمانان لەسـەری ڕۆیشـتوون بێگومـان ئـەو قورئـان خوێندنـە بێگیانـە و دوورە لەخشـوع و کاریگەری.

هـــەروەها فەرموودەکـــە ئامـــاژە دەکـــات بـــەخۆ دوورگرتنمـــان لـــەوەی کەسەرسامبین بەبیدعەچییەکان و سەرپێچیکاران و دەرچووان لەسنووری خـوا یان ئەوانەی لـەسەر شـێوازی گـۆرانی قورئـان دەخـوێنن لـەدەرەوەی سـنوری شەرعی و دیاریکراو بـەپێی زانسـتی تەجویـد و ئەحکامـەکانی. پێغەمبـەر(ﷺ)

دیاری کـردووه کەپێویسـته هـەوا و ئارەزووەکـان شـوێنکەوتەی شـەریعەت و پەیامی ئیسلام بێت.

**٤٧ – عن عبدالله بن عباس(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قـال: ((أقرأنـي جبريل على حرف فراجعته ثم لم ازل استزيده فيزيـدني حتـى انتهـى الى سـبعة أحرف)). ( رواه البخاري ومسلم)**

واتـه: جوبرەئیـل ( عليه السلام ) قورئـانی پێدەخوێندمـەوە یـان بۆدەخوێندمـەوە بەشێوازێك بەدوایدا دەمخوێندەوە. بەردەوام داوای زیاترم لێدەکرد ئەویش زیادی دەکرد تاکۆتایی هات بەحەوت خوێندنەوە.

قورئانی پیرۆز بەزمانی عەرەبی و لەناو هۆزەکانی عەرەبدا هاتۆتە خوارەوە کەهەندێك پیت دەربڕینیان جیاواز و مانای هەندێك وشـەش جیـاواز بـوو. جـا بۆئەوەی نەبێتە هۆکاری جیاکاری و مروونەت لەخوێندنەوەدا لەسەر( ٧) جـۆر خوێندنەوەدا قورئان دابەزی هەروەك فەرموودەکە ئاماژەی پێدەکات کەجوبرەئیل بە حەوت جۆر بۆ پێغەمبەری خوێندۆتەوە ئەوەش بۆ ئاسانکارییە هەروەك قورئان دەفەرموویت﴿وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ﴾(القمر/٢٢) واتـه: بێگومان ئێمە قورئانمان ئاسان کردووە( بۆ خوێندنەوە و تێگەیشتن و ئامۆژگـاری وەرگرتن) جائایا کەسێك هەیە کەدەرکی حەقیقـەت و ڕاسـتی بکـات و پەنـدی وەرگرتبێت.

( قراءات السبعة) واته: خوێندنەوەی حەوت جۆر لـەقورئان و سـوننەتدا جێگیر و چەسپاوە، دروسته بەهـەرجۆرێکیان قورئـان بخوێنرێـت. پێشـینانی ئـەم نەتەوە لەزانایان هەستاون بەدیاریکردنی ئەو خوێندنەوانەی بەتەواتر( یەك لەدوای یەك) و دەماودەم گێڕدراونەوە، نەوە دوای نەوە وەریگرتووە. هەرکەس بیـەوێت

زانیاری زیاتری دەست بکەوێت دەتوانێت بگەڕێتەوە بۆ نووسراوە درووستەکان دەربارەی خوێندنەوەکان وەئەم زانستە یەکێکە لەزانستەکانی قورئانی پیرۆز.

٤٨- عن عائشة(ﷺ) عن النبي( ﷺ) قال: ((الماهر بالقرآن مع سفرة الكرام البررة والذي يقرا القرآن وهو يشتد عليه له اجران)). ( رواه الاربعة) واتە: چالاك وزیرەك لەقورئان خوێندندا كەكاری پێدەكات لەگەڵ فریشتە ڕێزدارە پاكەكانە، وەئەوكەسەی قورئان دەخوێنێت و لەسەری گرانە پاداشتەكەی دووقاتە. ( سفرة) ئەو فریشتانەن كەلەجیهانی( ملكوت)دا قورئان دەخوێنن، سەرپێچی فەرمانەكانی خوا ناكەن. وەئەوەی فەرمانیان پێدەكات بەجێی دەهێنن﴿فِي صُحُفٍ مُّكَرَّمَةٍ * مَّرْفُوعَةٍ مُّطَهَّرَةٍ * بِأَيْدِي سَفَرَةٍ * كِرَامٍ بَرَرَةٍ﴾ (عبس/١٣- ١٦) واتە: ئەو قورئانە لەچەندین لاپەڕەی بەڕێز و پیرۆزدا هەڵگیراوە لە( لوح المحفوظ) وەرگیراوە، كەبەرز و بڵند و پاك و خاوێنن، بەدەستی فریشتە نووسەرەكان، كەبەڕێز و خواناس و ملكەچ و فەرمانبەردارن.

هەركەس قورئان خوێندن و لەبەركردن و جوان دەوركردنەوەی لەسەر ئاسان بێت لەگەڵ ئەو فریشتانەیە كەخوای گەورە قورئانی پێبەخشیون و چالاكن پێی و ئاسانە لەسەریان. بەڵام ئەوكەسەی لەقورئان خوێندندا زەحمەتی دێتەڕێ و لەبەركردن لەسەری گرانە و كەم خوێندەوارەیان عەرەبیزان نییە و لەنەتەوەكانی تری غەیرە عەرەبە پێتە عەرەبییەكان لەسەر زمانی گرانە، هەموو ئەوكەسانە پاداشتیان دووهێندەیە، پاداشتی جوان خوێندنەوە و دروست وە پاداشتی ئەو زەحمەت و ماندووبوونەی لەپێناوی فێربوون و دەوركردنەوەدا دێتەڕێی.

پێشەوا( اوزاعی) خوا لێی ڕازی بێت فەرموودەیەكی پێغەمبەر باس دەكات كە فەرموویەتی:(( ان العبد اذا قرأ فحرّف او اخطأ كتبه الملك كما نزل)) واتە: ئەگەر بەندە قورئانی خوێند و لێی تێكچوو یان هەندێك

لەخوێندنەوەکەی لایدا لەشێوازی خوێندنەوەی خۆی وەهەڵەی کرد، ئەوا فریشتە وەکو ئەوە بۆی دەنووسێت کەدابەزیوە. ئەم فەرموودەیە باسیش لەوە دەکات کە ئەوکەسە چەند هەوڵ دەدات و دووبارە و سێبارە دەچێتەوە بەسەر ئایەتەکەدا هەرهەڵەی تیادەکات و بۆی نایەت، ئەوا فریشتەکان وەکو ئەوەی کەدابەزیوە بۆی دەنووسن، چونکە﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾(البقرة/٢٨٦) بەلآم ئەگەر نەوکەسە کەمتەرخەمی کرد لەدووبارە نەکردنەوەدا بەبێ عوزر و بەهانەیەکی درووست ئەم فەرموودەیە نایگرێتەوە بەڵکو فەرموودەکانی تر(٢٢، ٢٣، ٢٤ )دەیگرێتەوە.

٤٩ – عن عبدالله بن مسعود(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ) : ((أقرأ عليَّ قلت: أقرأ عليك وعليك نزل؟ قال: ((اني اشتهي ان اسمعه من غيري))، قال فقرات(( النساء)) حتى اذا بلغت﴿ فكيف اذا جئنا من كل امة بشهيد وجئنا بك على هؤلاء شهيدا﴾ قال لي ((كف)) أو ((أمسك)) فإذا عيناه تذرفان. ( متفق عليه) . واتە: عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود(ﷺ) وتی: پێغەمبەری خوا فەرمووی: قورئانم بۆ بخوێنە، وتم: قورئانت بۆ بخوێنم لەکاتێکدا بۆتۆ دابەزیوە؟ فەرمووی: حەزدەکەم لەغەیری خۆمی ببیستم، عەبدوڵڵا وتی: سورەتی( النساء )م خوێندەوە تاگەیشتمە﴿فَكَيْفَ إِذَا جِئْنَا مِن كُلِّ أمَّةٍ بِشَهِيدٍ وَجِئْنَا بِكَ عَلَى هَـؤُلاء شهيداً﴾ (النساء/٤١) فەرمووی: بەسە، بوەستە، هەردوو چاوەکانی ئەسرینیان دادەباراند.

لەم فەرموودەیەوە دەگەینە ئەوەی کەبیستنی قورئان لەکەسانی تر کەبیخوێنن کارێکی باش و( مستحب)ە بەمەرجی بێدەنگی و گوێگرتن و کارلێك لەگەڵیدا. خوای گەورە دەفەرموێت وَإِذَا قُرِئَ الْقُرْآنُ فَاسْتَمِعُواْ لَهُ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ﴾ (الاعراف/٢٠٤) واتە: ئەگە قورئان خوێندرا گوێی بۆ

بگرن وبیّدەنگبن بەڵكو ڕەحمەتباران بكرێن. ﴿أَفَلاَ يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللّهِ لَوَجَدُواْ فِيهِ اخْتِلاَفاً كَثِيراً﴾ (النساء/٨٢) واتە: ئەوە بۆ تەدەبوری قورئان ناكەن وقاڵ نابنەوە خۆئەگەر لەلای غەیری خواوە بوایە ئاڵۆزی وجیاوازیەكی زۆری تیابەدی دەكرا. گریان لەخوێندنی قورئاند سوننەتە، چونكە دەرئەنجامی( تدبر) و ژیان و كارلێكەو لەترس و خۆشەویستی خواوە دێت. خوا فەرموویەتی:﴿ كِتَاباً مُّتَشَابِهاً مَّثَانِيَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ الَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ﴾ (الزمر/٢٣) واتە: خوای گەورە جوانترین و پیرۆزترین فەرمایشتی ناردۆتە خوارەوە كەئەم قورئانەیە (لەجوانی دارشتندا) بابەتەكانی لەیەك دەچن، هەندێك باسیشی بەشێوازی جیاواز تیادا دووبارە بۆتەوە، جا كاركردی ئەم قورئانە ئەوەیە كەتەزوو دەهێنێت بەگیان وپێستی ئەوكەسانەدا كەترسی پەروەردگاریان لەدڵ و دەروونـدا هەیە. پاشان گیان و پێست و دڵیان نەرم و ئامادە و چالاك دەبێت بۆ یادی خوا و خواپەرستی. لەفەرموودەدا هاتووە كەدوو چاو ئاگریان پێناگات: چاوێك بەتەنها لەترسی خوا فرمێسك برێژێت و بگری، وە چاوێك لەبەر خوا پاسەوانی بكات . ( ابو سعید الخزار) وتویەتی: ئەگەر بەندە مێشك و بیر و بۆچوونی هەمووی جەم بێت بۆ تێگەیشتن لە وتەی خوا( قورئان) خوای گەورە تێگەیشتنێكی تایبەت و ڕەسەنی وای دەداتێ كەنەیداوە بەكەسێ تر لە بەندەكانی.

**٥٠ – عن سعید بن ابي وقاص(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ) : ((اتلوا القرآن وابكوا فان لم تبكو فتباكو)). (اخرجه ابن ماجة باسناد جید) واتە: قورئان بخوێننەوە وبگرین، ئەگەر گریانتان بۆ نەهات خۆتان بگریەنن.**

**( صالح المرسی) دەڵێت: لەخەومدا قورئانم بۆ پێغەمبەر(ﷺ) خوێندەوە، فەرمووی: ئەی صالح ئەوە قورئان خوێندنەكەت، ئەی گریانەكەت كوا؟**

ئیبن عەبباس(ﷺ) دەفەرموویت: ئەگەر لـەکۆتایی سـورەتی( الاسـراء )دا ئایەتی (سجدە) تان خوێند پەلەمەکەن لە سجدە بردن تانەگرین ئەگـەر چاوتان فرمێسکی نەرِشت بـە دڵ بگـرین. لـە حەسـەنی بەصـریەوە( رەحمـەتی لێبێـت) گێردراوەتەوە کە عومەری کورِی خەتتاب(ﷺ) بە ئایەتێکدا تێدەپەرِی لـەویردی رۆژانـەی تەنگەنەفەسـی دەکـرد چـەند رۆژ لـە ماڵـدا دەمایـەوە تـا ئەورِادەیـە سەردانیان دەکـرد وایانـدەزانی کـە نەخۆشـە. ئـەبو دەرداء (ﷺ) دەیـوت بـەو کەسانەی کەشـەوانە درەنـگ قورئانیـان دەخوێنـد و بـەکوڵ دەگریـان و یـادی خوایان دەکرد باوکم بەقوربانیان بێت کەشەوانە لەنوێژەکانیاندا قورئان دەخوێنن و مافی تەواو دەدەن بە پیتەکان.

(تباکی) بریتییـە لـە خشـوع و بـەدەنگێکی حەزینانـە قورئـان بخـوێنن وە تەرکیزی تەواو بکەن لەترسی خوا و بەگەورەزانینی قورئانی پیرۆز.

٥١ - عن عبدالله بن عمر(ﷺ) قال: سـال رسـول الله(ﷺ): اي النـاس احسن قراءة؟ قال: ((من اذا سمعته يقرا رؤيت انه يخشى الله عـز وجـل)). ( رواه البـزار) واتـە: پرسـیار لـە پێغەمبـەر(ﷺ) کـرا: کـێ باشـترین قورئـان خوێنـە لەخەڵکی؟ فەرمووی: ئەوکەسەی ئەگەر گوێبیسـتی بوویـت قورئـانی دەخوێنـد پێوەی دیاربوو کەلە خوا دەترسێت.

کاتێك قورئان وەکو( مصـحف) بلاّوبـووەوە عەکرەمـەی کـورِی ئـەبو جەهل لەهۆش خۆی چوو دەیوت: ئەوە وتەی خوای پەروەردگارمە، ئەوە وتـەی خوای پەروەردگارمە، ئەوە وتەی خوای پەروەردگارمە، لەترسی ئەوەی کەوەکو پێویست قەدری نەگیرێت. عوسمان و حوزەیفە (ﷺ) دەفەرموون: ئەگەر دڵەکان پاك ببنەوە هەرگیز لە خوێندنی قورئان تێرنابن.

بە یوسفی کوڕی ئەسباتیان ووت: کەقورئان دەخوێنیت چ نزایەك دەکەیت؟ ووتی: چ نزایەك بکەم؟ ئیستیغفار دەکەم و داوای لێخۆشبوون لەخوا دەکەم لەکەم و کورتیم حەفتا جار ئەگەر بەندە وای کرد دەبێتە هۆی نزیکبوونەوە لە خوا. پێشەوا غەزالی وتوویەتی لە( احياء علوم الدين) دا: قورئان خوێندن سێ پلەی هەیە: نزمترینیان: بەندە وایدابنێت کەلەبەردەم خوای پەروەردگاردا قورئان دەخوێنێت، ئەویش گوێی بۆ گرتووە، لەم کاتەدا پێویستە ئەو بەندەیە داوا بکات و مەرایی و پاڕانەوە و لالانەوە بکات.

دووەم: بە دڵ ببینێ کەخوای گەورە سەیری دەکات و لەگەڵیدا دەدوێت ونیعمەتەکانی و چاکەکانی کەپێی بەخشیوە بۆ باس دەکات ئەوە مەقامی حەیا و شەرم و بەگەورە زانین و قاڵبوونەوەیە لە قورئاندا.

سێهەم: لە قسەکردنەکاندا بێژەر ببینێ و لە ووشەکاندا سیفاتەکان با سەیری خۆی و خوێندنەوەکەی نەکات یان نیعمەتەکان کەپێی بەخشراوە بەڵکو تەنها خۆی ببینێ بێژەرکە( خوا)یەو ڕوانین بۆ دەسەلات و توانای خوای گەورە کەئەوە پلەی موقەرەبین ونزیکانە لەخوا پێش ئەوە پلەی( اصحاب اليمين) ە لەوە بترازێت پلەی غافڵ وبێئاگایانە.

لەباسی پلەی بالادا پێشەوا( جعفر بن محمد الصادق) (ﷺ) وتوویەتی: والله خوای گەورە لە وتەکانیدا خۆی پیشانی بەندەکانی داوە، بەلام ئەوان نایبینن، وەسەبارەت بە حاڵەتێك کە لە نوێژدا بەسەری هاتووە کە بووراوەتەوە تێیدا دوایی کەهۆشی هاتۆتەوە بەرخۆی پرسیاریان لێکردووە بۆچی؟ لەوەلامدا وتوویەتی: چەندجارێك ئایەتەکەم دووبارە کردەوە لەدڵمدا تا دڵم ڕاچڵەکی کە کێیە قسە دەکات، لاشەم توانای وەستانی نەما لەبەردەم دەسەلات وگەورەیی خوادا.

# دەروازەی شەشەم

## ویردەکانی قورئان وخەتم کردنی

٥٢- عن عمر بن الخطاب(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ) : ((من نام عن حزبه أو عن شيء منه فقرأه فيما بين صلاة الفجر وصلاة الظهر كتب له كأنما قرأه من الليل)). ( رواه مسلم)

واتە: هەرکەس لەکۆتایی حزبەکەیدا یان لەبەشێکیدا خەوی لێکەوت ودواتر لەنێوان نوێژی بەیانی و نیوەڕۆدا بیخوێنێتەوە وەکو ئەوە وایە لەشەودا خوێندبێتی.

هەروەك لە فەرموودەکەدا بەدیار دەکەوێت پێویستە مسوڵمان ویردێکی ڕۆژانەو شەوانەی بۆخۆی دیاری کردبێت لەقورئان جانەو ویردە(جوزئێك یان حیزبێك یان نیو یان ربع الحزب یان بەئایەت بۆنموونە ڕۆژانە ٥٠ تا ١٠٠ ئایەت بۆ خوێندن) وەبەپێی ئاماژەی فەرموودەکە ویردی شەوانە باشترە بەهۆی ئەوەی کەخەڵکی هەمووی خەوتوون تەنها بێدارانی شەو نەبێت کەلەگەڵ قورئاندا دەژین و دەپاڕێنەوە و نزا دەکەن لەبارەگای خوای میهرەبان، بێگومان کاتە درەنگەکانی شەو فەڕ و بەرەکەت و پیرۆزی وبەرەکاتی تایبەتی خۆی هەیە. هەرکەس ویردی شەوانەی دیاری کردبوو بەردەوام بوو لەسەری، بەڵام بەهەر هۆیەکەوە بوو نەیتوانی بیخوێنێت یان تەواوی بکات، دواتر قەرەبووی دەکاتەوە لەنێوان نوێژی بەیانی و نوێژی نیوەڕۆدا، ئەوا وەکو ئەوە وایە کەلەشەودا خوێندبێتی.

خوای گەورە هەڵە و لەبیرچوون و ئەوەی کەزۆریان لێدەکرێت لەسەر مسوڵمانان هەڵگرتووە﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا﴾ (البقرة/٢٨٦) واتە: خوای گەورە تەکلیفی زیاد لەتوانای کەسێك ناخاتەسەری و توشی حەرەجی ناکات. ئەوە مسوڵمان خۆیەتی کە ویردی شەوانە یان ڕۆژانەی بۆ خۆی دیاری کردووە. واتە فەرز نییە وەکو نوێژ و ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان، بەڵام بێگومان شەونوێژ یان قورئان خوێندن لەپلە و پایەی مرۆڤ بەرز دەکاتەوە لای خوای پەروەردگار. وەئەوەش نابێت لەسنوری تواناکانی مرۆڤ بچێتە دەرەوە یان پێچەوانەبێت لەگەڵ سوننەتێك لە سوننەتەکانی خوای گەورە لەبوونەوەردا وەکو وازهێنان لەخەو یان لەخواردنی خۆش یان فەرامۆشکردنی ژن ومناڵ...... هتد.

یەکێك لە نیعمەتەکانی خوا لەسەر ئوممەتی محمد(ﷺ) ئەوەیەکە هەرکار وپەرستشێك پێش سەفەر ونەخۆشی ئەنجامیانداوە، بەڵام دواتر نەخۆشی یان سەفەر و گەشتەکەی دەبنە ڕێگر لەئەنجامدانی ئەوا هەمان پاداشتی کار و پەرستشەکانی بۆ دەنووسرێت. لەگەڵ پاداشتی ئازار و بارگرانییەکانی سەفەر و نەخۆشییەکە، چونکە ئارامگرن.

**٥٣**– عن اوس بن حذيفة( ﷺ) قال: كنت في الوفد الذين اتوا النبي(ﷺ) فذكر حديثا ان النبي(ﷺ) كان سحر معهم بعد العشاء فمكث عنا ليلة لم يأتنا حتى طال ذلك علينا بعد العشاء، قال: قلنا: ما أمكثك عنا يارسول الله(ﷺ) قال: ((طرأ عليّ حزب من القرآن فاردت ان لا اخرج حتى اقضيه))، قال: فسألنا اصحاب رسول الله(ﷺ) حين اصبحنا قال قلنا: كيف تحزبون القرآن؟ قالوا نحزبه ثلاث سور وخمس سور وسبع سور وتسع سور واحدى عشرة سورة وثلاث عشرة سورة وحزب المفصل من( ق) حتى يختم. ( رواه ابوداؤد وابن ماجة باسناد جيد)

واتە: لە ئەوسی کوڕی حوزەیفەوە(ﷺ) لەگەڵ وەفدێکدا بووم کە چوون بۆلای پێغەمبەر(ﷺ) باسی فەرموودەیەکی کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) شەو دوای نوێژی عیشا لەگەڵمان مایەوە شەوێکی تر تێپەڕی بەسەرماندا، نەهات بۆلامان تا ئەوەی بەلامانەوە زۆر بوو وەدرێژخایەن بوو، دواتر هاتەوە لامان، وتمان ئەی پێغەمبەری خوا چی دووری خستیەوە لێمان؟ فەرمووی: حیزبێك لەقورئانم بەسەرەوە بوو ویستم نەیەمە دەرەوە تا تەواوی دەکەم. بۆ بەیانی پرسیارمان لە هاوەڵانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد ووتمان: چۆن قورئان لەسەر حیزب دابەش دەکەن؟ وتیان: بەشی دەکەین وەکو حزب، سێ سورەت، پێنج سورەت، حەوت سورەت، نۆ سورەت ویانزە سورەت وسیانزە سورەت وەحیزبی جیاکەرەوە یان بەرفراوان لە( ق) ەوە تا کۆتایی.

ئەم فەرموودەیە ئەوەی لێ وەردەگیرێت کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوور بووە لەسەر تەواو کردنی ویردی دیاریکراوی شەوانەی قورئانی، تەنانەت پێش ئەوەشی دەخات کەبچێت بەدەم کەسانێکەوە کەتازە مسوڵمان بوون و هاتوونەتە مەدینە بۆئەوەی فێری ئاینەکەیان بن لەپێغەمبەرەوە(ﷺ). لەوانەیە کەسێك بڵێت: ئایا سەرقاڵ بوونی زانایان بەزانست و لێکۆڵینەوە و توێژینەوە لەوبوارەدا و فێرکردنی خەڵك باشترنییە لەپەرستش و خوێندنەوەی قورئان؟ وەڵام ئەوەیە کەتەنها زانست و هێزی بەڵگەیی هەڵگرەکەی بەس نییە بەڵکو بەوەی کەخوا دەیخاتە ناودڵی بێژەر و واعیزەکە و لەسەرزمانی لە تەقوا و بەرەکاتی کارەکە. ئەوەش پێویستی بەترس و پەرستشی زیاتری خوای گەورەو خوێندنەوەی زیاتری قورئانی پیرۆز. ئەوەتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بارگرانی پەیامە ئاسمانییەکە و گەیاندنی( کەزۆر قورسە) وای لێنەکرد کەنەپەرژێتە سەر ویردە قورئانییەکەی و

شەونوێژ. تا ئەوڕادەی کەقاچە پیرۆزەکانی ئاوسابوون کاتێک پرسیاری لێکرا دەربارەی ئەوە فەرمووی:(( ئایا بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم)) .

ئەو ئەحزابانەی کەلەبەشی دووەمی فەرموودەکەدا هاتووە و سەرجەم هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بریتییە لەڕۆژی یەکەمدا سێ سورەت کە لە( البقرة) تا( النساء) لەڕۆژی دووەمدا پێنج سورەت لە( المائدة) تا( التوبة) لەڕۆژی سێهەمدا حەوت سورەت لەسەرەتای سورەتی( یونس) تاکۆتایی( النمل) لەڕۆژی چوارەمدا نۆ سورەت لەسەرەتای سورەتی( الاسراء ) تاکۆتایی سورەتی( الفرقان) لەڕۆژی پێنجەمدا لەسەرەتای سورەتی( الشعراء ) تاکۆتایی( یس) لەڕۆژی شەشەمدا لەسەرەتای سورەتی( الصافات) تاکۆتایی سورەتی( الحجرات) لەڕۆژی حەوتەمدا لەسورەتی(ق) تاکۆتایی سورەتی( الناس) .

ئەوەی باسمان کرد لەهاوەڵێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگۆڕێت. دەگێڕنەوە کەعوسمانی کوڕی عەففان(ﷺ) بەم شێوەیە ویردەکانی خوێندووە:

١- شەوی هەینی سورەتی( البقرة) تا سورەتی( المائدة)ی دەخوێند.

٢- شەوی شەممە سورەتی( الانعام) تاسورەتی( هود)ی دەخوێند.

٣- شەوی ١شەممە سورەتی( یوسف) تاسورەتی( مریم)ی دەخوێند.

٤- شەوی ٢شەممە سورەتی( طه) تاسورەتی(القصص)ی دەخوێند.

٥- شەوی ٣شەممە سورەتی( العنکبوت) تاسورەتی( ص)ی دەخوێند.

٦- شەوی ٤شەممە سورەتی( الزمر) تاسورەتی( الرحمن)ی دەخوێند.

٧- شەوی ٥شەممە خەتمەکەی تەواو دەکرد.

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت کەهاوەڵان زۆر سووربوون لەسەر ویردە قورئانییەکان و سەرجەمیان(ﷺ) هەموو هەفتەیەك خەتمێکیان کردووە.

٥٤- عن عبدالله بن عمرو(رضي الله عنه) قال: قـال رسـول الله( ﷺ) : ((اقـرأ القرآن في شهر))، قلت إني لأجد قوة حتى قال: ((اقـراه في سـبع ولاتـزد علـى ذلك)). ( متفق عليه)

واتـه: لـه عەبـدوڵڵای کـوڕی عـەمرەوە(رضي الله عنه) فـەرمووی: پێغەمبـەری خوا(ﷺ) فەرمووی پێم: قورئان له مانگێکـدا خـەتم بکـە، وتم توانـا و هێـزی زیاترم هەیە. فەرمووی: بیخوێنەوە و خەتمی بکە لەحەوت ڕۆژدا لـەوە زیـاتری مەکە.

فەرمانی یەکەمی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ عەبدوڵڵا خـەتمکردنی قورئـان بـوو مـانگی یـەك جـار، بـەڵام توانـای عەبـدوڵڵا لـەوەزیاتر بـوو لەبەرئـەوە پێغەمبەر(ﷺ) بۆی زیادکرد کەلـەماوەی هەفتەیەکـدا خـەتمی بکـات ئـەوەبوو عەبدوڵڵا بەدرێژایی تەمەنی وەسیەتەکەی پێغەمبەری بەجێ هێنـا، بـەڵام کاتێـك توانای کزبوو پەشیمان بوو لەوەی کەبۆچی فەرمانەکەی پێغەمبەری وەرنەگرت کە لە مانگێکـدا خـەتمی بکـات. وەپێشـی نـاخۆش بووکەلابـدات لەفـەرمانی دووەمی کە لە هەفتەیەکدا خەتمی بکات.

بەوشێوەیە هـاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) سـووربوون لەسـەر خوێندنـەوە و دەورکردنـەوەی قورئـان، خـوای گـەورە دەفـەرمووێت: ﴿فَاسْتَبِقُواْ الْخَيْرَاتِ﴾(البقرة/١٤٨) واتـە: پێشـبڕکێ بکـەن لەچـاکەکاندا. ئاراسـتەو وەسیەتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هاوەڵانی(رضي الله عنهم) لەئاستی توانا و لێهاتنیاندا بوو، خۆی باشی دەناسین، چونکە ئەو پێغەمبەر و پێشەوا و مامۆسـتا و سـەرمەشـقیان بوو. تەنانەت لە ئاراستەکانیدا جیاوازی دەکرد لەنێوان هاوەڵێك بـۆ یـەکێکی تر. کاتێك فەرمووی مانگی جارێك خەتمی قورئان بکەن، واپێدەچێت ئـەوە بـۆ

زۆرینەی مسوڵمانان بێت، بەڵام فەرمانی دووەم خەتم کردنی قورئانە لـەماوەی هەفتەیەکدا بۆ کەسێکە کەخۆی توانای هەبێت.

٥٥- عن عبدالله بن عمرو قال: قال رسول الله(ﷺ) : ((من قرأ القرآن في اقل من ثلاث لم يفقهه)). ( رواه ابو داؤد والترمذي وقال حسن صحيص) واتـە: هەرکەس قورئان خەتم بکات لەماوەی سێ ڕۆژ کەمتر ئەوە لێی تێنەگەیشتووە

ئەم فەرموودەیە ئاماژە بەوە دەکات کە پەلـەکردن لـەقورئان خوێندنـدا کارێکی ناپەسەندە بەتایبەتی کەلەشێوازی گونجاو و دروستی خۆی دەریبکـات. لەفەرموودەکەدا ئاماژەی ئەوەی تیانییە کەخەتم کردنی لەماوەی سێ ڕۆژ کەمتر قەدەغە کردبێت، بەڵکو ئاماژەی ئەوەی تیایە کـە بـەردەوام وابێـت و گرنگـی بەتێگەیشتنی نەدات بەڵکو تەنها مەبەستی ژماردنی خەتمەکانیەتی.

پرسیار لە پێشەوا مالك کرا دەربارەی کەسێك کەهەموو شەوێك خەتمی قورئان دەکات، فـەرمووی: چـەند کـارێکی باشـە! قورئـان پێشـەنگی هـەموو چاکەیەکە. دەگێڕنەوە کە عوسمانی کوڕی عـەففان هەنـدێك جـار لەشـەوێکدا خەتمی قورئانی کردووە. پێشتر باسمان کرد کەلـەماوەی حـەوت ڕۆژدا خـەتمی قورئانی کردووە.

هەندێك لەپیاوچاکان وتوویانـە: خـەتمێکی هەفتانـەمان هەیـە، خـەتمێکی مانگانە و خەتمێکی ساڵانە وەخەتمێکیشم بەدەستەوەیە ماوەی ٣٠ سـاڵە هێشـتا تەواو نەبووم.

نـزاو پاڕانـەوە لـەکۆتایی خەتمەکـەدا قبـوڵ و وەرگـیراوە لەبەرئـەوە ئامادەبوون وئەمین کردن لەوکاتەدا کارێکی باشە. هـەروەها هاوکـاری کـردن لەخەتم کردن بەوشێوەیە کەحەلقەیەك دروسـت بکرێـت و هەرکـەس بەشـێك لەقورئان بخوێنێت پاشان بەدەستەجەمعی نزاو پاڕانەوەی خەتم بکرێـت کـارێکی

باش و سوننەتێکی چاکە، چونکە قورئانی پیرۆز باشترین کۆکەرەوە و دۆستایەتی بەخشە کەهەموان لەیەکتر نزیك بکاتەوە و کۆبکاتەوە و ئامادەی نزای خەتم بن و ئامینی بۆبکەن.

٥٦- عن عبدالله بن عباس(رضي الله عنه) قال كان النبي(ﷺ) اجود الناس بالخير واجود مايكون في رمضان لأن جبريل كان يلقاه في كل ليلة في شهر رمضان حتى ينسلخ يعرض عليه رسول الله( ﷺ) القرآن فاذا لقيه جبريل كان اجود بالخير من الريح المرسلة.( متفق عليه) واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە(رضي الله عنه) فەرمووی: پێغەمبەر بەخشندەترین کەس بووە لەچاکەکردندا، لەڕەمەزاندا زیاتر بەخشندە بووە، چونکە جوبرەئیل هەموو شەوێکی ڕەمەزان پێی دەگەیشت تاکۆتایی دەهات پێغەمبەری خوا قورئانی پەخش دەکرد لەسەری‌و بۆی دەخوێندەوە کاتێك جوبرەئیل پێی دەگەیشت لەچاکەکردندا لە شنەشەماڵێکی نێردراو بەخشندەتر بوو.

پێغەمبەر(ﷺ) قورئانی دەخوێندەوە و دەوری دەکردەوە لەشەوانی ڕەمەزاندا بۆ جوبرەئیل بەشێوەیەك گیانی گەشەی دەکرد و ئاسوودەتر دەبوو بەوەش بەخشندەیی لەچاکە و خێردا زیاتر دەبوو بەڕادەیەك کە کەس لەئاستیدا نەبوو. لەڕووی بەخشینەوە هەر ماڵ و سامانێك دەهاتە بەردەستی دەیبەخشی و حەزی نەدەکرد بۆ ساتێکیش لای بمێنێتەوە، تائەوەی کە هەندێك جار لەبیری دەچوو کەبەشی ماڵ و منداڵی دابنێت. خێر لە فەرموودەکەدا مەبەست زیاتر( ماڵ)ە پارە و پول و پێداویستییەکانی ژیان هەروەك خوای گەورە لەقورئاندا لەسەر زمانی( موسى) دەفەرمووێت: ﴿رَبِّ إِنِّي لِمَا أَنزَلْتَ إِلَيَّ مِنْ خَيْرٍ فَقِيرٌ﴾(القصص/٢٤) واتە: خوایە، پەروەردگارا تۆ خێر و بێری زۆرت بەسەردا ڕژاندووم، بەڵام هێشتا هەژارم و ئاتاجی بەخششی زیاترم.

ئەگەر( خێر) بریتی بێت لە کاری چاکە ئەوا خەبات و فیداکاری و جیهادی پێغەمبەر(ﷺ) لەڕەمەزاندا نموونەیەکی ڕۆشن و بەرز بوو ئامۆژگاری ڕۆژووانانی دەکرد ئەگەر کەسێك جنێوی پێدان و شەڕی لەگەڵدا کردن کەبڵێین ئێمە بەڕۆژووین.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرجەم کاتەکانی ژیانی ئاسانکار و نەرم ونیان بووە لەکڕین و فرۆشتن و دادوەریدا. ئەگەر(خێر) بریتی بێت لە وتەی جوان و شیرین ئەوا ڕەوشتی پێغەمبەر قورئانی بوو.

کاری چاکە لەڕەمەزاندا دووبەرامبەرە، سوننەت خێری فەرزی هەیە، فەرزیش خێرەکەی یەك بەدە تا حەوتسەد و خوا زیاتری دەکات بۆ کەسێك کەبیەوێت. باشترین کات بۆئەوەی لەخزمەتی قورئاندا بین مانگی پیرۆزی ڕەمەزانە، چونکە مانگی قورئانە﴿شَهْرُ رَمَضَانَ الَّذِيَ أُنزِلَ فِيهِ الْقُرْآنُ هُدًى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَاتٍ مِّنَ الْهُدَى وَالْفُرْقَانِ﴾ (البقرة/١٨٥) واتە: مانگی ڕەمەزان ئەو مانگەیە کەقورئانی تیادا هاتۆتە خوارەوە لەکاتێکدا ئەم قورئانە ڕێنموویی بەخشە بەخەڵکی و بەڵگەی زۆری تیادایە لەڕێنموویی و جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست.

خوای گەورە مانگی ڕەمەزانی ڕێزدارتر کردووە بەوەی کە قورئانی تیادابەزاندووە﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ* وَمَا أَدْرَاكَ مَا لَيْلَةُ الْقَدْرِ* لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ ﴾ (القدر/١-٣) واتە: ئێمە بەڕاستی قورئانمان دابەزاندۆتە خوارەوە لەشەوێکی بەفەڕ و ڕێزداردا، تۆ چووزانی شەوی بەفەڕ کامەیە و چ خێر و بەرەکەتێکە، شەوی قەدری بەڕێز لەهەزار مانگ خێردارتر وبەڕێزترە.

ئەگەر ڕێزی شەوێك بەدابەزینی قورئان تیایدا بگاتە هەزار مانگ زیاتر و خێرتر، بێگومان( دڵێك یان کەسێك یـان ماڵێـك یـان کۆمـەڵێك) کـەقورئانی لەئامێز گرتبێت لای خوای گەورە هەزارقات بەڕێزتر و خۆشەویست ترە.

**٥٧– عن عائشة( ﵂): اسر الي رسول الله(ﷺ) : ((ان جبريل كان يعارضني بالقران كل سنة وانه عارضني العام مرتين ولا اراه الا حضـر اجلـي)).** ( رواه البخـاري) . واتـە: لـە عائشـەوە(﵂): پێغەمبـەر(ﷺ) نهێنییـەکی بـۆ درکانـدم یـان چـپاندی بـۆم کـە جوبرەئیـل سـاڵی جارێـك دەوری قورئـانی پێدەکردمەوە، بەڵام ئەمساڵ دووجار دەوری قورئانی پێکردمەوە، هیچی تیانابینم ئەوەنەبێت کەئەجەلم نزیك بۆتەوە.

پێشەوا ئەبو حەنیفـە بەڕەحمـەت بێـت وتویـەتی: هەرکـەس لەسـاڵێکدا دووجار قورئان بەباشی خەتم بکـات ئـەوا مـاف داوە، چـونکە پێغەمبـەر(ﷺ) لەوساڵەدا کەکۆچـی دوایـی کـرد دووجـار قورئـانی لەبـەردەم جوبرەئیلـدا خوێندەوە. پێشـەوا ئەحمەد کوڕی حەنبـەل ( بەڕەحمـەت بێـت) وتویـەتی: خـەتم کردنی قورئان پێویستە لە٤٠ ڕۆژدا تەواو بکرێت، چونکە عەبدوڵڵای کـوڕی عومەر پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد لەچەند ڕۆژدا خەتم بکەین، فـەرمووی: لە چل ڕۆژدا.

پێشەوا غەزالی(﵀) لە ( احياء علوم الدين)دا دەڵێت: چوار جۆر خەتم هەیە:

١. خەتم لەشەو ورۆژێکدا کەلای زانایان ناباشە.
٢. خەتم کردن لەمانگێکدا، واتە لە هـەموو ڕۆژێکـدا جوزئێـك، وەکـو ئەوەی کەلەیەکەمدا زیادەڕەوی بکات لەخێرا خـەتم کردنـدا، دووەم

زیادەڕەوی لەکەم خوێندنەوەدا. لەنێوان ئەو دوانەدا دووپلە هەیە مامناوەندە:

- لەهەفتەیەکدا یەك خەتم.
- لەهەفتەیەکدا دوو خەتم نزیك ببێتەوە لەسێ خەتم.

باشتر وایە خەتمەیەك بەشەوبکرێت و خەتمەیەك بەڕۆژ. خەتمەی ڕۆژ باشتروایە لەڕۆژی دووشەممەدا لە دوو ڕکاتی نوێژی بەیانیدا یان دوای نوێژ. خەتمەی شەوەکە لەدوو ڕکاتی نوێژی مەغریبدا یان دوای نوێژ لەشەوی هەینیدا. ئەوەش بۆ ئەوەی سەرەتای شەوو سەرەتای ڕوژ پێشوازی بەخەتم بکرێت کە دەبێتە هۆی داوای ڕەحمەت و سۆزی خوایی لەلایەن فریشتەکانەوە.

٥٨- عن العرباض بن سارية(ﷺ) عن النّبي(ﷺ) قال: ((من ختم القرآن فله دعوة مستجابة)). (رواه الطبراني)

واتە: هەرکەس قورئانی خەتم کرد نزایەکی وەرگیراوی هەیە.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿ادْعُونِي أَسْتَجِبْ لَكُمْ﴾ (غافر: ٦٠) واتە: بانگم بکەن و بپاڕێنەوە لێم، دێم بەهاناتانەوە...پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرموێت:( الدعاء هو العبادة) واتە: نزاو پارانەوە پەرستشە و عیبادەت...خوای گەورە چەند کاتێکی دیاری کردووە کەنزا و پاڕانەوە تیایدا قبوڵ و وەرگیراوە:

- سێ یەکی کۆتایی شەو.
- کاتی باران بارین.
- کاتژمێرێك لە ڕۆژی هەینیدا.
- لەکاتی خەتم کردنی قورئاندا.

نزاکردنیش چەند جۆرێکی هەیە:

١- نابێت نزای خراپ دژ بە مسوڵمانان بکرێت بەتیاچوون و دووچاربوون بەڕۆژی ڕەش.

٢-نزا کردن نەبێت بۆ بچڕاندنی سیلەی ڕەحم.

٣-دڵنیابوون لەگیرابوونی نزاکە لەکاتی داواکردنیدا.

٤-نزا کردن بەلالانەوە و دڵشکاوی و جۆرێك لەکزۆڵەیی.

٥-زۆرکردن و دووبارە و چەندبارەکردنەوەی نزا و پاڕانەوە.

٦-نابێت کە نزا دەکات لەئەنجامدانی تاوانێکدا بێت.

٧-نابێت ناوسك و گەدەی پڕکردبێت لەحەرام یان پۆشاکی حەرام بێت یان لەسەرزەوییەکی داگیرکراودابێت بەستەم.

٨-نابێت لەوکاتەدا سەیری شتێکی حەرام بکات یان لەپاڵ نزاکەدا وشە و ڕستەی حەرام بڵێ.

٩-پێویستە تەوبەی لە گوناهەکانی کردبێت بەدڵسۆزی و ڕاستگۆیی.

١٠-نابێت لەنزاکردنەکەیدا ڕیابازی و سەرسامبوون بەخۆی تێدابێت.

نزاکردن لەکاتی تەواوکردنی خەتمی قورئاندا وەکو وەرگرتنی کرێی کرێکار وایە کەکرێی کارەکەی وەردەگرێت. هەر قورئانخوێنێکیش باش خەتمەکەی کردبێت و لەگەڵیدا ژیابێت و کارەکەی تەنها و تەنها بۆخوا و لەبەرخوا بووبێت، ئەوا شایانی ئەوەیە کەبەتەواوی پاداشتەکەی وەربگرێت کە ئەویش گیرابوونی نزاکەیەتی وەهەرکەس کەموکورتی تیابوو لەوە بەجێدەمێنێت بۆ خوای گەورە، لەگەر بیەوێت وەریدەگرێت یان هەڵیدەگرێت بۆ دوارۆژ یان کارێکی دنیایی بۆ ئاسان دەکات یان بەهەرجۆرێکی تر کەخۆی بڕیاری تیابدات کەداناوەرترین زاتە.

٥٩- كان رسول الله(ﷺ) يقول عند ختم القرآن: ((اللهم ارحمني بالقرآن واجعله لي اماماً وهدى ورحمة، اللهم ذكّرني منه ما نسيت وعلّمني منه ما جهلت وارزقني تلاوته اناء الليل واطراف النهار واجعله لي حجة يارب العالمين)). ( رواه الارجاني وابوبكر بن الضحاك)

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەخەتمکردنی قورئاندا دەیفەرموو: خوایا، پەروەردگارا ڕەحمەت بارانم بکە بە قورئان و بۆم بکە بە پێشەوا و ڕێنومایی و میهرەبانی و سۆز. خوایە لەبیرمی بهێنەوە ئەوەی بیرمچۆتەوە وەفێرمی بکە ئەوەی نایزانم، خوێندنەوە و دەورکردنەوەیم پێببەخشە کاتەکانی شەو وکەنارەکانی ڕۆژ ( واتە وام لێبکە شەو وڕۆژ لەخزمەتی خوێندنەوەی قورئاندابم) وەبۆم بکە بە حجە و بەڵگەی ڕزگاری و سەرفرازی هەردوو دنیا ئەی پەروەردگاری جیهانیان.

پێویستە گرنگی بەنزا و پاڕانەوەی خەتم کردنی قورئان بدەین ئەو فەرموودەیەی سەرەوەش بەڵگەیە، تا بکرێت ئەو نزایانەی کە پێغەمبەر و یاران، یان نزا قورئانییەکان، باشە. وەهەر نزایەکی تر کەئیسلاح و چاکسازی دینی و دنیایی تیا باشەو ئینشاء الله لای خوای میهرەبان وەرگیراوە.

# دەروازەی حەوتەم
# قورئان خوێندن لە نوێژدا

٦٠ – عن جابر بن عبدالله(ﷺ) قال: سئل رسول الله(ﷺ): اي الصلاة افضل؟ فقال: طول القنوت.( رواه مسلم) واتە: جابری کوڕی عەبدوڵلا(ﷺ) وتی: پرسیار لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرا: کام نوێژ باشترینە؟ فەرمووی: زۆر مانەوە و قورئانی زۆر خوێندنەوە.

( طول القنوت) واتە زۆر مانەوە لەنوێژدا و قورئانی زیاتر خوێندنەوە تیایدا. باشترین کات بۆ زۆر مانەوە لە نوێژدا، شەونوێژە و کاتە درەنگەکانی شەوە. خوای گەورە هەندێك شوێنی تایبەت کردووە بۆ بەندایەتی، ئەنجامدانی بەندایەتیش تیایدا پلەی بەرزتری هەیە لەشوێنی تر وەکو ماڵی خوا( بیت الله الحرام) کەعبەی پیرۆز و مزگەوتی پێغەمبەری خوا لە مەدینە و مزگەوتی( اقصی) لە قودس. هەندێك کەسیشی تایبەتمەند کردووە لای خۆیەوە وەکو پێغەمبەران و پیاوچاکان وەهەندێك کاتیشی تایبەتمەند کردووە بۆ نزا و پاڕانەوە کەتیایدا قبوڵ و گیرایە وەئەنجامدانی خێرترە لەکاتی تر. لەبەرئەوە نوێژەکان جیاوازن لەدرێژی و کورتیدا، وەلەوەی چ سورەتێك بخوێنی تیایاندا خێری زیاترە لەگەڵ ئەوەدا کەهەر سورەتێك بخوێنی لەنوێژەکاندا دروستە، بەلام خوای گەورە هەندێك سورەتی تایبەت کردووە بە پاداشتی گەورەتر و وەلامدانەوەی نزا وپاڕانەوە خێراتر و گیرابوونی زووتر لە هەندێکی تر. خواش باشتر زانایە.

٦١- عن عبدالله بن عمر (رضي الله عنه) قال صليت مع النبي (ﷺ) ليلة فلم يزل قائماً حتى هممت بامر سوء قلنا وما هممت؟ قال هممت ان اقعد واذر النبي(ﷺ). ( رواه البخاري)

واتە: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە(رضي الله عنه) وتی: شەوێك لەگەڵ پێغەمبەردا نوێژم کرد، هەر بەپێوە بوو درێژەیدا بەنوێژەکەی، تائەوەی واهاتە دڵم کەنیەتێك یان کارێکی خراپ بکەم. وتمان: چیت لەخەیاڵدا بوو؟ وتی: وام بەخەیاڵدا هات کەدابنیشم و واز لە پێغەمبەر بهێنم ( واتە نوێژەکەی پێغەمبەر ئەوەندە درێژ بووە عەبدوڵلا چ بەرگەی زۆر مانەوەی نەگرتووە، ویستوویەتی نوێژەکەی ببڕێت یان دابنیشێت. )

پێغەمبەر(ﷺ) لەشەونوێژدا زۆر دەمایەوە بەڕادەیەك کەقاچە پیرۆزەکانی ئاوسابوون، کاتێك کەعائیشە دایکی باوەڕداران پرسیاری لێدەکرد کەبۆچی والەخۆت دەکەیت لەکاتێکدا خوا لەگوناهی پێشینە و پاشینەت خۆش بووە؟ لەوەلامدا دەیفەرموو:( افلا اکون عبدا شکورا) واتە: ئایا لەبەرامبەر ئەوەدا بەندەیەکی سوپاسگوزار نەبم.

خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الْمُزَّمِّلُ *قُمِ اللَّيْلَ إِلَّا قَلِيلاً * نِصْفَهُ أَوِ انقُصْ مِنْهُ قَلِيلاً *أَوْ زِدْ عَلَيْهِ وَرَتِّلِ الْقُرْآنَ تَرْتِيلاً﴾ ( المزمل/ ١-٤) واتە: ئەی ئەوکەسەی خۆت داپۆشیوە، ئەی محمد(ﷺ) شەو هەستە نوێژ بکە مەگەر کەمێکی نەبێت، نیوەی یان کەمتر لەنیوەی لێ کەم بکەرەوە، یاخود زیاتری بکە و دەوری قورئان بکەرەوە بەووردی و لەسەرخۆ.

شەونوێژ لەسەرەتای بانگەوازی پێغەمبەردا(ﷺ) فەرز و واجب بوو، بەلام دواتر خوای گەورە لەسەر مسوڵمانانی ئاسان کرد﴿فَاقْرَؤُوا مَا تَيَسَّرَ مِنَ الْقُرْآنِ﴾ (سورة المزمل/ ٢٠) واتە: چەندەتان بۆ کرا بەو ئەندازە قورئان بخوێنن.

ئەوەش شێوازێکی پەروەردەیی ناوازە و سەرکەوتوو بوو لەپەروەردە کردنی نەوەی یەکەمی بانگەوازی ئیسلامیدا لەهاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ بەرگەگرتنی ئەوهەموو ئازار ودەربەدەرییەی کەدووچاری بوون. ڕاهێنانیان لەسەر بەرگەگرتنی قورسی پەرستش لەکاتی پشوودانی خەڵکانی تردا بۆئەوە بوو کە بتوانن ڕووبەڕووی هەرشتێکی لەوە گرانتر و دژوارتر ببنەوە و خۆڕاگربن بەرامبەری. بێگومان تەنها باوەڕەکەیان بوو کەتوانا و وورەیان بەرز بکاتەوە تاکو بەرگری لەئاین و پەیامەکەیان بکەن.

٦٢- عن حذيفة بن اليمان (ﷺ) قال: صليت مع النّبي(ﷺ) فافتتح البقرة فقلت يركع عند المائة ثم مضى فقلت يصلي بها في ركعة فمضى فقلت يركع بها ثم افتتح النساء فقرأها ثم افتتح ال عمران فقرأها مترسلا اذا مد باية تسبيح سبح واذا مر بسؤال سأل واذا مر بتعوذ تعوذ ثم ركع فجعل يقول سبحان ربي العظيم فكان كل ركوعه نحواً من قيامه ثم قال سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد ثم قام طويلا قريبا مما ركع ثم سجد فقال: سبحان ربي الاعلى فكان سجوده قريباً من قيامه. ( رواه مسلم)

واتە: لە حوزەیفەی کوڕی یەمانەوە(ﷺ) وتی: نوێژم لەگەڵ پێغەمبەر(ﷺ) کرد دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی( البقرة) وتم لەئایەتی سەدەمیندا دەچێتە رکوع، پاشان بەردەوام بوو، وتم: نوێژەکەی پێدەکات( واتە ڕکاتەکەی پێ تەواو دەکات). بەردەوام بوو، وتم: دەچێتە ڕکوع، دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی( النساء ) تەواوی کرد پاشان دەستی کرد بەخوێندنی سورەتی ( ال عمران) ئەویشی تەواو کرد، خوێندنەکەی بە ووردی و لەسەرخۆ بوو، ئەگەر بەئایەتی( تسبیح)دا تێدەپەڕی تەسبیحاتی دەکرد کاتێك بە ئایەتی داواکردن و نزادا تێدەپەڕی نزاو داوای دەکرد. کاتێك بەئایەتی پەناگرتندا تێدەپەڕی پەنای

دەگرت بەخوا. پاشان چووە ڕکوع و فەرمووی: ( سبحان ربي العظيم) ڕکوعەکەی نزیکی وەستان و خوێندنەکەی بوو، پاشان فەرمووی: ( سمع الله لمن حمده ربنا لك الحمد) ئەویش بەڕادەی ڕکوعەکەی وەستا، پاشان چووە سجدە وفەرمووی: ( سبحان ربي الاعلى) ئەویش بەڕادەی وەستانەکەی بوو.

ئەبو زەری غەففاری(رضي الله عنه) فەرموویەتی: کڕنوشی زۆر ( سجدە) بەڕۆژ باشترە، وەزۆر وەستان لەشەونوێژدا باشترە. مەبەست ئەوەیە کە لەڕۆژدا چەند زیاتر نوێژی سوننەت زیاتر بکەیت باشترە ئەگەرچی ڕکاتەکانی کورت بن، بەلاّم لەشەودا واباشە کە لەنوێژەکاندا قورئانی زۆری تیا بخوێنرێت.

٦٣- عن ابي ذر الغفاري(رضي الله عنه) قال: قام رسول الله(ﷺ) فينا ليلة بآية يرددها وهي﴿إِن تُعَذِّبْهُمْ فَإِنَّهُمْ عِبَادُكَ وَإِن تَغْفِرْ لَهُمْ فَإِنَّكَ أَنتَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ﴾ (المائدة/١١٨) . ( اخرجه النسائي وابن ماجة بسند صحيح) واتە: لەئەبی زەری غەففارییەوە(رضي الله عنه) فەرمووی: شەوێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لەناوماندا هەستا و شەونوێژی کرد و ئەم ئایەتەی دووبارە دەکردەوە(( ئەگەر سزاو ئازاریان بدەیت ئەوانە بەندەی خۆتن وەئەگەر لێیان خۆش ببیت ئەوا خۆت گەورە و دەسەلاّتدار و دانا و کاربەجێیت)).

خوای گەورە دەفەرموویت:﴿ كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ مُبَارَكٌ لِّيَدَّبَّرُوا آيَاتِهِ وَلِيَتَذَكَّرَ أُولُوا الْأَلْبَابِ﴾(ص/٢٩) واتە: ئەم قورئانە کتێبێکی پیرۆزە دامان بەزاندووە بۆلای تۆ بۆئەوەی ئایەتەکانی لێکبدەنەوە و بیری لێبکەنەوە و بۆئەوەی خاوەن بیر وهۆشەکان پەند و ئامۆژگاری وەربگرن و تێفکرن. تێفکرین و یادکردنەوە و( تدبر) بەئامادەبوونی دڵ دەبێت.

( تميم الداري) کەیەکێکە لە هاوەڵە بەرزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) لەشەوێکدا کەهەستا ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە:﴿ أَمْ حَسِبَ الَّذِينَ اجْتَرَحُوا

السَّيِّئَاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَالَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ (الجاثية/٢١) واتە: ئایا ئەوانەی کەگوناهو تاوانەکانیان ئەنجامداوە، وایان زانیوە هەروەك ئەوانە حسابیان بۆ دەکەین کەئیمانیان هێناوە و کاروکردەوە چاکەکانیان ئەنجامداوە؟

سەعیدی کوڕی جوبەیر(ﷺ) لەهەستانی شەوێکدا ئەم ئایەتەی زۆر دووبارە دەکردەوە:﴿ وَامْتَازُوا الْيَوْمَ أَيُّهَا الْمُجْرِمُونَ﴾ (يس/٥٩) واتە: یاخییەکان پێیان دەوترێت: ئادەی تاوانکار و گوناهباران جیابکەنەوە.

**٦٤- عن ابي برزة(ﷺ) ان رسول الله(ﷺ) كان يقرأ في صلاة الغداة بالستين الى المائة. ( رواه النسائي)**

واتە: پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنوێژی بەیانیدا شەست تا سەد ئایەتی دەخوێند.(صلاة الغداة) مەبەست نوێژی بەیانییە کە پێغەمبەریخوا(ﷺ) لەنێوان( ٦٠-١٠٠ ) ئایەتی تیادەخوێند.

عومەری کوڕی خەتتاب(ﷺ) لەنوێژی بەیانیدا سورەتی( النحل) پاشان سورەتی (یوسف)ی دەخوێند. بەوپێیە خوێندنی قورئانی زۆر لەنوێژی بەیانیدا سوننەتێکی پێغەمبەر(ﷺ) و یارانی بووە. خوای گەورەش دەفەرموویێت:﴿ قُرْآنَ الْفَجْرِ إِنَّ قُرْآنَ الْفَجْرِ كَانَ مَشْهُوداً﴾ ( الاسراء/٧٨) واتە: نوێژی بەیانی ( کەزۆر قورئانی تیادا دەخوێنرێت، فەرامۆش مەکە) بەڕاستی قورئان خوێندنی نوێژی بەیانی دەبینرێت لەلایەن فریشتەکانەوە.

**٦٥- عن ابن عباس(ﷺ) ان النَبي(ﷺ) كان يقرأ في صلاة الفجر يوم الجمعة تنزيل السجدة وهل اتى على الانسان. ( رواه النسائي)**

واتە: لە ئیبن عەباسەوە(ﷺ) گێڕراوەتەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژی بەیانی ڕۆژی هەینیدا سورەتی( السجدة) و سورەتی( الدهر) ﴿ هل اتى على الانسان﴾ی دەخوێند.

هەروەها لە( صحیح) دا هاتووە کەپێغەمبەر(ﷺ) لەنوێژی جەژندا هەردوو سورەتی( ق) و ( القمر)ی دەخوێند.

٦٦- صلى انس بن مالك( ﷺ) الظهر فلما فرغ قال: اني صليت مع رسول الله(ﷺ) صلاة الظهر فقرأ لنا بهاتين السورتين في الركعتين سبح اسم ربك الاعلى وهل اتاك حديث الغاشية. ( رواه النسائي)

واتە: ئەنەسی کوڕی مالک (ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی کرد پاش تەواو بوون فەرمووی: من لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆم کرد لەدوو ڕکاتی یەکەمدا ئەم دوو سورەتەی خوێند﴿ سبح اسم ربك الاعلى﴾ واتە سورەتی( الاعلى) دووەم﴿ هل اتاك حديث الغاشية﴾ واتە سورەتی( الغاشية).

ئەو دوو سورەتە مامناوەندن کەلەکۆتایی قورئاندان و ئەوەگونجاوە بۆ نوێژی نیوەڕۆ بەهۆی سەرقاڵی خەڵك بەکار و کاسبی و بەدەست هێنانی بژێوی ژیان، لەبەرئەوە درێژکردنەوەی نوێژ باش نییە.

٦٧- عن سليمان بن يسار عن ابي هريرة(ﷺ) قال: ماصليت وراء احد اشبه صلاة برسول الله(ﷺ) من فلان. قال سليمان: كان يطيل الركعتين من الظهر ويخفف الاخريين ويخفف العصر ويقرأ في المغرب بقصار المفصل ويقرأ في العشاء بوسط المفصل ويقرأ في الصبح بطوال المفصل. ( رواه النسائي)

واتە: لەسلیمان کوڕی یەسارەوە لەئەبی هورەیرەوە(ﷺ) فەرموویەتی: لەدوای کەسێکەوە نوێژم نەکردووە کەبەڕاددەی نوێژی فلان لەنوێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بچێت. سلێمان وتی: دووڕکاتی نوێژی نیوەڕۆی درێژ دەکردەوە

ودووانەکەی تری کورت دەکـردەوە، نوێـژی عەسـری کـورت دەکـردەوە، لەنوێژی ئێوارەدا سورەتە کورتەکانی کۆتایی قورئـانی دەخوێنـد، وەلەنوێـژی عیشادا سورەتە مام ناوەندەکانی کۆتـایی قورئـانی دەخوێنـد، بـەلاّم لەنوێـژی بەیانیـدا سـورەتە درێـژەکانی کۆتـایی قورئـانی دەخوێنـد. ( المفصـل) کەلەفەرموودەکـەدا هـاتووە بریتییـە لـەکۆتایی قورئـان لەسـورەتی( ق) تـا سورەتی( الناس) . بەوشێوەیە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە دوورکـاتی بەیانیـدا سورەتە درێژەکانی کۆتـایی قورئـانی دەخوێنـد، چـونکە سـەرەتا و دەسـپێکی ڕۆژێکی نوێیە، مرۆڤ پێویستی بە خـۆراك و توێشـوی ڕۆحییـە هـەروەك چـۆن پێویسـتی بـە خـۆراکی مادییـە. زۆر مانـەوە لـە نوێـژدا واتـە ڕۆچـوون لـە خۆشەویستی خوادا و بەگەورە زانینی خوای گەورەیـە و پێچـەوانەی خـەڵکی بێئاگا کارکردنە، بەلاّم قورئان خوێندن لە نوێژی نیوەڕۆ و عەسرلەسورەتە مام ناوەندەکاندا ڕێخۆشکردنە بۆئەوەی خەڵکی لە ئـیش و کـار نـەبن و بگـەڕێن بەدوای ڕۆزی و فەزڵی خوای گەورەدا.

لە نوێژی مەغریبدا سورەتی کورت دەخوێنرێت بەهۆی کورتی ماوەی نوێژەکە. لەنوێژی عیشادا سورەتی ناوەند دەخوێنرێت، چونکە خاتمە و کۆتایی نوێژەکانە وکاتی خەو وپشـوودانە. ئەگـەر کەسـێك دوای خـەوتنی پێویسـت هەستایەوە بۆشەونوێژ و زۆرمایەوە لە نوێژەکانیدا و قورئانی زۆری تیا خوێنـد لەکاتێکدا زۆرینەی خەڵکی لەخـەوێکی قوڵـدان و دنیـا کـش وماتـە، ئـەوە پاداشتەکەی زۆر گەورەیە و پلە وپایـەی زۆر بـەرزە، بـەلاّم سـوننەتەکانی تـر بەشێوەیەکی گشتی قورئـان خوێنـدن تیایـدا لـەنێوان سـورەتە ناوەنـدەکان و کورتەکانە.

٦٨- عن عبدالله بن عمر(ﷺ) قال: رمقت رسول الله(ﷺ) عشرين مرة يقرأ بعد المغرب وفي الركعتين قبل الفجر قل يا ايها الكافرون وقل هوالله احد. ( رواه النسائي والترمذي عن ابن عباس وقال حديث حسن)

واتە: لە عەبدوڵلای کوڕی عومەرەوە(ﷺ) فەرمووی: سەیری پێغەمبەری خوام کرد(ﷺ) وەتێبینیم کرد بیست جار دوای مەغریب و لە دوورکاتی پێش نوێژی بەیانیدا ( واتە لەدوو ڕکاتی سوننەتی بەیانیدا) سورەتی( الکافرون) و (الاخلاص) ی دەخوێند. واتە( قل یا ایها الکافرون) و( قل هو الله احد) .

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدووڕکاتی پێش کۆتایی سوننەتی ویتر سورەتی (الاعلی) واتە﴿ سبح اسم ربك الاعلی﴾ و سورەتی( الکافرون) واتە﴿ قل یاایها الکافرون﴾ و لەڕکاتی کۆتاییدا سورەتەکانی﴿ قل هو الله احد﴾ و ﴿ قل اعوذ برب الفلق﴾ و ﴿ قل اعوذ برب الناس﴾ ی دەخوێند.

پێشەوا شافعی و مالك و ئەبو حەنیفە وئەحمەد کوڕی حەنبەل لەسەر ئەوسوننەتە ڕۆیشتوون و لەڕکاتی کۆتایی ویتردا﴿ قل هو الله احد﴾یان بەتەنها دەخوێند.

٦٩- عن جابر بن عبدالله(ﷺ) قال كان معاذ بن جبل(ﷺ) يصلي بالناس فقرأ البقرة فخرج رجل من الصلاة واتم لنفسه فقالوا نافق الرجل، فتشاكيا الى رسول الله (ﷺ) فزجر رسول الله(ﷺ) معاذا فقال: افتان انت يا معاذ؟ اقرأ سورة سبح والشمس وضحاها. ( متفق عليه)

واتە: لەجابری کوڕی عەبدوڵلاوە (ﷺ) فەرمووی: مەعازی کوڕی جەبەل(ﷺ) پێشنوێژی بۆ خەڵکی کرد، سورەتی( البقره) ی خوێند، پیاوێك لەجەماعەت جیابوەوە وخۆی نوێژی خۆی تەواوکرد. وتیان نفاقی کردووە،

چوونه لای پێغەمبەر سکالآیان کرد، پێغەمبەری خوا سەرزەنشتی مەعازی کرد وفەرمووی: ئەوه تۆ ئـاژاوه دەنێیتـەوه یـان خـەڵك لـەئاین دووردەخەیتـەوه؟ سورەتی( سبح و والشمس وضحاها) بخوێنه.

ســوننەت وایــه نوێــژی بەکۆمــەڵ بەشـێوەیەك بێــت کــەلاوازترینی بەشداربووان بتوانن نوێژەکـەیان بەکۆمـەڵ بکـەن. خـوا پێویسـتی بـەئازاردان وبێزارکردن وماندووکردنی نوێژخوێنان نییه بـەهۆی درێژکردنـەوەی نوێـژەوه بەزۆرەملێ لـەکاتێك ئەنجامدانی نوێژەکه بەخوێندنی چەند ئایـەتێکی کـورتیش دەکرێت، بەڵکو سوننەتی پێغەمبەره(ﷺ) کەخێری جەماعەتی کـورت زیـاتره لـەخێری نوێـژی جەماعـەتی دوور و درێـژ، ئـەویش لەبەرئـەوەی لەدووەمـدا ئازاردان و بێزار وماندووکردنی مسولّمانانی تێدایه بەتایبەتی نـەخۆش و پـیر و پەککەوتەکان و بێبەش کردنیان لـەخێری ئەنجامدانی نوێژی بەکۆمـەڵ. ئەمـەش پێچەوانه نییه لـەگەڵ ئەو دیاری کردنەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خوێنـدنی هەنـدێك سـورەت، خۆزگـه ئیلتیزامـی پێـوه بکرایـه لەنوێژەکانـدا. لەگـەڵ ئەوەشـدا هەرکەمکردنەوەی خوێندنی ئایەتەکان باشـتره تـا زیـادکردنی لـەکاتی بـوونی نەخۆش وپیر ولاواز یان هەر حەزکردنی مسولّمانان بەنوێژی کورت. عیتاب و سەرزەنشتی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ مەعاز و هەرکەسێکی ترکەدەبێته ئیمام لەنوێژدا فێرکردن وپەروەردە کردنه بـۆ مراعـات کردنـی لاواز و پـیر و نـەخۆش بـێ ئەوەی ببێته هۆی زیادەڕۆیی و لادان یـان پشـتگوێ خسـتن وفەرامۆشـکردن. هەرکەس حەزدەکات زیاتر لەنوێژدا بمێنێتـەوه و قورئـانی زۆر بخوێنێـت ئـەوه ئازادە و بوار لـەبەردەمیدا کراوەیـە بەتایبـەتی لــه شـەونوێژدا و بەتـەنیا دوور لەچـاوی خـەڵك کــه دووره لــەڕیا و ڕووپامـایی جگــه لەنوێـژه فـەرزەکان کەباشتروایه لەڕیزی نوێژی بەکۆمەڵدا و لـەمزگەوت ئەنجامی بدات.

٧٠- عن عبدالله بن عمر(رضي الله عنه) قال: ان النبي(ﷺ) يقرأ علينا السورة فيها السجدة فيسجد ونسجد حتى مايجد احدنا موضع جبهته. ( رواه البخاري)

واته: لە عەبدوڵڵای کوڕی عومەرەوە(رضي الله عنه) فەرمووی: پێغەمبەر(ﷺ) سورەتێکی بەسەرماندا دەخوێندەوە کە( سجدە) کڕنوشی تێدابوو، سجدەی دەبرد و ئێمەش سجدەمان دەبرد، تائەورادەی کەشوێنی نێوچاوانمان نەبوو.

سوجدەی تیلاوە سوننەتە، لە چواردە شوێنی قورئاندا هەیە. دوای خوێندنەوەی ئایەتی سجدە ڕاستەوخۆ سوننەتە سجدە ببرێت. فەرموودەکە ئاماژە بەوە دەکات کەپێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام دوبارەی کردۆتەوە، ئەوەش زیاتر لەکاتی فێرکردن و وانەدادانی هاوەڵانیدا بووە(رضي الله عنهم) کەزۆر قەرەباڵغ بووەبەرادەیەك کەهەندێکیان شوێنی سوجدە بردنی نەبووە بەڵکو لەسەر پشتی ئەوانی تر سوجدەیان بردووە. ئایەتەکانی سوجدە هانی مسوڵمانان دەدات بۆ سوجدە بردن وەزەمی کافر و بێباوەڕان دەکات لەوەی کەسوجدە نابەن هەروەك خوا دەفەرموێت دەربارەی هەردوو بەرەکە: ﴿إِذَا يُتْلَى عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلأَذْقَانِ سُجَّداً* وَيَقُولُونَ سُبْحَانَ رَبِّنَا إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولاً﴾ (الاسراء/١٠٧-١٠٨) ﴿وَإِذَا قُرِئَ عَلَيْهِمُ الْقُرْآنُ لَا يَسْجُدُونَ﴾ (الانشقاق/٢١) واتە: ئەگەر قورئان بەسەریاندا بخوێنرێتەوە(سجدە) کڕنوش نابەن.

٧١- عن ابي سعيد الخدري(رضي الله عنه) قال: قرأ رسول الله(ﷺ) وهو على المنبر سورة ( ص) فلما بلغ السجدة نزل فسجد وسجد الناس معه، فلما كان يوم اخر قرأها فبلغ السجدة تشزن الناس للسجود فقال رسول الله(ﷺ): (انما هي توبة نبي ولكني رأيتكم تشزنتم للسجود)). فنزل وسجد وسجدوا. ( رواه أبو داؤد)

واته له ئه‌بی سه‌عیدی خدرییه‌وه(ﷺ) فه‌رمووی: پێغه‌مبه‌ری خـوا ﷺ له‌سه‌ر مینبه‌ر بوو سوره‌تی(ﷺ)ی خوێنده‌وه تاگه‌یشته ئایه‌تی( سجده) له‌سـه‌ر مینبه‌ر دابه‌زی و سوجده‌ی برد، خه‌ڵکه‌که‌ش هه‌موویان له‌گه‌ڵیـدا سـوجده‌یان برد. ڕۆژێکی تر خوێندییه‌وه گه‌یشته ئایه‌تی(سجده) خه‌ڵکه‌کـه خۆیـان ئامـاده کرد بۆ سوجده‌بردن پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) فه‌رمووی: بێگومـان ئـه‌وه ته‌وبـه‌ی پێغه‌مبه‌رێکه، به‌ڵام ده‌تانبینم خۆتان ئامـاده‌کردووه بـۆ سـوجده‌بردن، دابـه‌زی له‌سه‌ر مینبه‌ر سوجده‌ی برد، ئه‌وانیش سوجده‌یان برد.

له‌وانه‌یه ئه‌م فه‌رمووده‌یه ئاماژه به‌وه‌بكات كه‌سوجده له‌سوره‌تی(ص)دا جه‌ختكراو نییه( غیر مؤكد)ه یان له‌وانه‌یه ئه‌وه بێت كه‌پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) بیـه‌وێت پێمان بڵێت سوجده له‌قورئاندا هه‌مووی سونه‌ته نـه‌ك فـه‌رز. شـتێكی تیانییـه ئه‌گه‌ر له‌هه‌ندێك كاتدا نه‌برێت، به‌ڵام به‌شێوه‌یه‌كی گشتی سوجده‌بردن باشتره و پاداشتی گه‌وره‌ی هه‌یه.



# دەروازەی هەشتەم

## فەزڵ و خێری هەندێک سورەتی دیاریکراو

پێشەوا شعرانی لەکتێبەکەیدا بەناوی ( لواقح الانوار القدسیة في بیان العهود المحمدیة) دەڵێت: پەیمانێکی گشتیمان لێ وەرگیراوە لەپێغەمبەری خوا(ﷺ) کەبەردەوامبین لەسەر خوێندنی هەندێك ویردی قورئانی لەهەموو شەووڕۆژێکدا وەك سورەتی( الفاتحة، ایة الکرسي، سێ ئایەتی کۆتایی سورەتی( البقرة)، کۆتایی سورەتی (ال عمران)، خوێندنی سورەتی( یس) و ( الواقعة) و ( الدخان) و ( تبارك) و هاوشێوەی ئەوانە). فەرموودە لەوبارەوە زۆر و ئاشکران. هەرکەس بەردەوامبێت لەسەری ئەوە پارێزراوە لەزۆرێك لەئافاتەکان و دەردەکان و لەشەڕی سیحر و جادوو خراپەکاران چ ئاشکرابن یان پەنهان.

خەڵکانێکی زۆر ئەمڕۆ لەئەنجامدانی ئەوسوننەتە گەورەدا خۆیان دەدزنەوە، بەتایبەتی خوێندکاران بەناوی سەرقاڵی بەزانست و زانیارییەوە یان کەسانی تر بەبیانوی جۆراوجۆرەوە، گوایە هەرکاتێك ئەنجامیدەدەن بریتییە لەدەعوەو خزمەت بەقورئان، بەلام دەبێت ئەوەمان لەبیرنەچێت کەهاوەڵان(ﷺ) لەهەمووکەس زیاتر سەرقاڵی کاروبانگەواز و جیهاد و تێکۆشان بوون، بەلام ئەوە ڕێگر نەبووە لەبەردەم خوێندن و دەورکردنەوەی

قورئان. زۆربەی کاتەکان بەفیڕۆ دەچن و هیچ شوێنێك ناگرێت کە دەتوانرێت سوودی باشی لێ ببینرێت.

٧٢- عن ابي سعيد بن المعلّي(ﷺ) قال: كنت اصلّي فدعاني النبي(ﷺ) فلم اجبه قلت يارسول الله(ﷺ) كنت اصلي، قال: الم يقل الله استجيبوا لله وللرسول اذا دعاكم لما يحييكم ثم قال: الا أعلمك اعظم سورة في القرآن قبل ان تخرج من المسجد؟ فأخذ بيدي فلما أردنا الخروج قلت: يارسول الله(ﷺ) انك قلت لاعلمنك اعظم سورة في القرآن. قال: الحمدلله رب العالمين هي سبع المثاني والقرآن العظيم الذي اوتيته. ( رواه البخاري وابو داؤد)

واتە: لە ئەبی سەعید کوڕی ئەلمەعللی(ﷺ) وتی: نوێژم دەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) بانگی کردم وەڵامم نەدایەوە، وتم: ئەی پێغەمبەری خوا نوێژم دەکرد، فەرمووی: ئەوەنییە خوای گەورە دەفەرمووێت:( وەڵامی خوا و پێغەمبەر بدەنەوە ئەگەر بانگی کردن بۆئەوەی ژیانبەخشە پێتان، پاشان فەرمووی: ئایا گەورەترین سورەتت لەقورئاندا فێربکەم و پێبلێم پێش ئەوەی لەمزگەوت دەربچیتە دەرەوە؟ دەستمی گرت، کاتێك ویستمان بچینە دەرەوە، وتم ئەی پێغەمبەری خوا تۆ فەرمووت گەورەترین سورەتت لەقورئان فێردەکەم، فەرمووی:﴿ الحمد لله رب العالمين﴾ ئەوە حەوت ئایەتە و قورئانی گەورە و بەرزە کەبۆم هاتووە.

٧٣- عن ابن عباس(ﷺ) قال: بينما جبريل عليه السلام قاعد عند النبي(ﷺ) سمع نقيضاً من فوقه فرفع راسه فقال: هذا باب في السماء فتح اليوم ولم يفتح قط الا اليوم فنزل منه ملك فقال هذا ملك نزل الى الارض لم ينزل قط

الا اليوم فسلّم وقال: ابشر بنورين اوتيتهما لم يؤتها نبي قبلك فاتحة الكتاب وخواتيم سورة البقرة لن تقرأ بحرف منها الا اعطيته. ( رواه مسلم)

واتە: لە ئیبن عەباسەوە(ﷺ) فەرموویی: کاتێك جبریل سڵاوی لێبێت لای پێغەمبەر دانیشتبوو گوێی لەجیڕەیەك بوو لەسەروو سەریەوە، سەری بەرز کردەوە و فەرمووی: ئەوە دەرگایەك لەئاسمان ئەمڕۆ کرایەوە، کەهەرگیز نەکراوەتەوە جگە لە ئەمڕۆ، فریشتەیەك لێی هاتۆتەخوارەوە، فەرمووی ئەوە فریشتەیەکە دابەزیوە بۆسەر زەوی هەرگیز دانەبەزیوە جگە لە ئەمڕۆ فەرمووی: مژدەبێت بەدوو نوور و ڕووناکی کەبۆت هاتووە. هیچ پێغەمبەرێك پیش تۆ بۆی نەهاتووە ئەویش( فاتحة الكتاب) و کۆتایی سورەتی( البقرة) هیچ کامیان ناخوێنیتەوە بەپیتێك ئیلا دەستت دەکەوێت.

ئیبن مەسعود(ﷺ) ڕیوایەتی کردووە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: دوو ئایەت لەکۆتایی سورەتی( البقرة) هەرکەس لەشەودا بیخوێنێت بەسیەتی، دەپارێزێت لەدووژمنان و موسیبەتەکان، دووژمنانی لەمرۆڤ و جنۆکە ونارەحەتیەکانی دوارۆژ لەو شەوەیدا لەقەلایەکی ئەمیندا بەسەر دەبات، خوا دەفەرمووێت: ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ﴾ (البقرة/١٣٧) واتە: خوا دەتپارێزێت لێیان. کۆتایی سورەتی(البقرة) لەئایەتی﴿لِّلَّهِ مـا فِـي السَّـمَاوَاتِ وَمَـا فِـي الأَرْضِ﴾ تاکۆتایی ئایەتی( ٢٨٤-٢٨٦). کارێکی باشە لەکۆتایی ئایەتەکاندا ئامین بکرێت، چونکە جوانترین نزاو پاڕانەوەی تیایە وەکو سورەتی فاتیحە.

٧٤- عن ابي بن كعب(ﷺ) عن النَبي(ﷺ) قال: ((يا أبا المنذر اتدري اي اية من كتاب الله معك اعظم؟ قلت: الله ورسوله اعلم، قال: يا أبا

المنذر اتدري اي آية من كتاب الله معك اعظم؟ قال: قلت الله لااله الاهو الحي القيوم قال: فضرب في صدري وقال: والله ليهنك العلم أبا المنذر. ( رواه مسلم وابو داؤد)

واته: له ئوبەی کوڕی کەعبەوە(ﷺ) لـه پێغەمبـەر(ﷺ) دەگێڕێتـەوە کەفەرموویەتی: ئەی باوکی مونزیر، ئایا دەزانیت چ ئایەتێك لەقورئان لـەگـەڵتا گەرەترینە؟ وتم: خوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن. فـەرمووی: ئـەی بـاوکی مونزیر، ئایا دەزانیت چ ئایەتێك لە کتێبەکەی خوا لـەگـەڵتا گەورەترینـە؟ وتم: الله لااله الاهو الحي القيوم دەڵێ: پێغەمبەر کێشای بەسەرسنگمدا و فەرمووی: سوێند بەخوا زانست پیرۆزبابیت لێدەکات باوکی مونزیر.

سەیری ئەدەبی ئەو هاوەڵە بەرێزە بکە لـەگەڵ پێغەمبـەری خـوادا بـەو وەڵامەی کەخوا و پێغەمبەرەکەی باشتر دەزانن لـەکاتێکدا کەوەڵامەکەی لایـە. پیاوە گەورەکان ئەو ئەدەبەیان هەبووە لـەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ)، چـونکە بەدەستی خۆی پەروەردەی کردن. بەڕاستی باشترین هـاوەڵ بـوون و باشـترین ئەدەبی دادابوون.

٧٥- عن ابي امامة الباهلي(ﷺ) عن النبي(ﷺ) قال: اقرأوا القرآن فانه يأتي يوم القيامة شفيعاً لاصحابه. اقرأوا الزهراوين البقرة وسورة آل عمران فانهما يأتيان يوم القيامة كانهما غمامتان او كأنهما غيابتان او كأنهما فرقان من طير صواف تحاجّان عن اصحابهما اقرأوا سورة البقرة فان اخذها بركة وتركها حسرة ولاتستطيعها البطله. (رواه المسلم والترمذي)

واتە: قورئان بخوێننەوە، بێگومـان لـەڕۆژی دوایـدا دەبێتـە شـەفیع و تکاکـار بـۆ هاوەڵـەکانی. دوو( زهـراوین) سـورەی( البقـرة) و( ال عمـران) بخوێننەوە، چـونکە ڕۆژی دوایـی هـەروەکو دوو پەڵـە هـەور یـان دوو چـەتر کەسێبەر دەکات یان وەکو جیاکەرەوەیەکی باڵندەیەك کەبگەڕێت بەرگری لە هاوەڵەکانیان دەکەن. سورەتی (البقرة) بخوێننەوە، چونکە وەرگرتنی بەرەکەتـە وازهێنان لێی حەسرەت و پەشیمانی و نەگبەتییە، ئەهلی باطیـل لە جن و ئینس نایتوانێ. سورەتەکانی( البقره) و( ال عمران) زۆرێـك لەئەحکامـەکان و پەنـد وئامۆژگارییەکانی تیایە. هەرکەس لەبـەریان بکـات و سـنورەکانیان بپارێزێـت وەفەرمانەکانیان بەجێ بهێنێت و قەدەغەکراوەکانی وازلێ بهێنێـت مافێکـە لای خوایە کە بیانکاتە تکاکار بۆ هاوەڵەکەیان. هەردوو سورەت بەرەکەت وفەڕ و خێرن بۆ کەسێك لەگەڵیاندا بژی و بیانخوێنێتەوە. حەسرەت و پەشـیمانییە بـۆ کەسێك وازبهێنێت لێیان کاتێك دەبینێت خوا چـی ئامـادە کـردووە بۆئەوانـە کەخوێندوویاننەوە.

٧٦- قال ابوبكر الصـديق(ﷺ) للنبـي(ﷺ) : قـد شـبت يارسـول الله(ﷺ)، قال: شيبتني هود واخواتها الواقعة والمرسلات وعـم يتسـاءلون واذا الشمس كورت. (رواه الترمذي)

واتە: ئەبوبەکری صدیق بەپێغەمبـەری فـەرموو: ئـەی پێغەمبـەری خـوا پیربوویـت، ئـەویش فـەرمووی: سـورەتی هـود و دەستەخوشـکەکانی پیریـان کردووم کەسـورەتەکانی (الواقعـة، المرسـلات، عـم يتسـاءلون، واذا الشـمس كورت) سورەی هود ئایەتی ئیستیقامەت و ڕاوەسـتاوی تێدایـە﴿فَاسْـتَقِمْ كَمَـا أُمِرْتَ﴾ (هـود/١١٢) واتە: ڕاوەستاوو دامەزراوبە هەروەکو فـەرمانت پێـدراوە.

ئـەو فەرمانـە تـەنها تايبـەت نييـە بەپێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـەڵكو بـۆ شـوێن كەوتوانيشە﴿مَن تَابَ مَعَكَ وَلاَ تَطْغَوْاْ﴾ واتە: وەهەركەس لەگەڵ تۆدا تەوبـەی كردووە، لامـەدەن و يـاخی مـەبن، بـەڵام سـورەتەكانی تـر( المرسـلات، عـم يتساءلون، اذا الشـمس كـورت)هـەمووی باسـی رۆژی دواييـە و ناخۆشـی و بارگرانييەكانی ئەو رۆژە و ئازارەكانی دۆزەخييـەكانی بـاس كـردووە. باسـی رۆژێكـی تيايـە كـە منـاڵ پـير دەكـات، ئاگاداركردنـەوەی خـەڵكی تێدايـە. لەسورەتی( المرسلات) دا چەندجارێك واوەيلا و هاوار بـۆ درۆزنـانی تێدايـە. لەسـورەتی( عـم يتسـاءلون)دا چـەند جارێـك وەسـفی قيامـەتی تێدايـە. لەسورەتی( التكوير)دا باسی رووداوە ترسناكەكانی دوارۆژەكانی گۆڕانكاری وتێكچوونی شيرازەی ئەم بوونەوەرەی تێدايە. هەروەها لەسـورەی( الواقعـة)دا كە خافضە و رافعەيە و وەسفی حاڵی هاوەڵانی بەهەشت و دۆزەخ و ئەوانـەش لەچاكەدا پێشبڕكێيان كردووە كە لەنزيكانی خوان.

٧٧- عن أبي سعيد الخـدري(ﷺ) عـن النَّبـي(ﷺ) قـال: مـن قـرأ سورة(الكهف) يوم الجمعة اضاء له مـن النـور مـابين الجمعـتين. ( رواه البيهقـي والحاكم وصححه)

واتە: هەركەس سورەی( الكهف) بخوێنێت لـەرۆژی هەينيـدا نـوور و ڕووناكييەكی دەست دەكەوێت كەنێوان دوو هەينی بۆ ڕووناك دەكاتەوە.

٧٨- عن أبي الدرداء(ﷺ) أن رسول الله(ﷺ) قال: من حفظ عشر ايات من اول سورة الكهف عصم من الدجال. ( رواه مسلم واحمد وأبو داؤد)

واته: هەرکەس دە ئایەت لەسەرەتای سورەی( الکهف) لەبەر بکات پارێزراو دەبێت لەشەڕی دەجال و سیحربازەکانی تر.

لەڕیوایەتێکی تر هاتووە کە دە ئایەت لەکۆتایی سورەی( الکهف) لەبەر بکات. کەواتە باشتروایە کەلەسەرەتا و کۆتاییدا دە ئایەت لەبەر بکەین، ئەگەر سورەتەکە هەمووی لەبەربکرێت زۆر باشترە وخوێندنیەتی ڕۆژانی هەینی.

٧٩- عن معقل بن يسار(رضي الله عنه) قال: ((قلب القرآن( يس) لا يقرؤها رجل يريد الله والدار الاخرة الاغفر له. اقرأوها على موتاكم)). ( رواه الامام أحمد والبيهقي وصححه)

واته: لە معقلی کوڕی یەسارەوە(رضي الله عنه) فەرموویەتی: دڵی قورئان سورەتی( یس)ە ، هەرکەس بیخوێنێتەوە مەبەستی خوا و ڕۆژی دوایی و ماڵی قیامەت بێت لێخۆشبوونی دەست کەوتووە و خوا لێی خۆش بووە. بیخوێنن بەسەر مردووەکانتاندا.

٨٠- عن أبي امامة الباهلي(رضي الله عنه) عن النبي(ﷺ) قال: من قرأ حم الدخان في ليلة الجمعة أو يوم الجمعة بنى الله له بيتا في الجنة. ( رواه الطبراني وصححه)

واته: لە ئەبی ئومامەی باهلیەوە(رضي الله عنه) دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەس حم سورەی( الدخان) شەوی هەینی یان ڕۆژەکەی بخوێنێت خوای گەورە ماڵێکی لەبەهەشتدا بۆ دروست دەکات.

٨١- عن عبدالله بن فعفل(رضي الله عنه) قال: رأيت رسول الله(ﷺ) يوم الفتح وهو يقرأ على راحلته سورة الفتح. ( رواه ابن ماجة)

واته: له عەبدولڵای کوڕی فعفل(رضي الله عنه) دەگێڕنەوه کە فەرموویەتی: پێغەمبەری خوام(ﷺ) بینی لەڕۆژی فتح و ڕزگارکردنی مەککەدا لەسەر پشتی ولاخەکەی (ئەسپەکەی) سورەی( الفتح)ی دەخوێند.

لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان دەست دەکەوێت کەدروستە بەڵکو کارێکی باشە کەلەسەفەر و گەشت و سواری و پیادەدا و لەرێگەدا قورئان خوێندن. لە عومەری کوڕی عەبدول عەزیزەوە دەگێڕنەوە(رضي الله عنه). هەروەها فەرموودەکە ئاماژە بەوەش دەکات کەلەگەشت و لەماڵدا و لەهەرماڵێکی تردا قورئان بخوێنین وەخوێندنی سورەی( الفتح) لەرۆژی( فتح) ئاماژەیە بەوەی کەئایەت و سورەتی تایبەت بە مناسەبات بخوێنینەوە.

٨٢- عن عبدالله بن مسعود(رضي الله عنه) قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: من قرأ سورة الواقعة كل ليلة لم تصبه الفاقة ابداً. ( رواه ابوعبيد وابويعلى وابن مردوية والبيهقي)

واته: له عەبدولڵای کوڕی مەسعودەوه(رضي الله عنه) فەرمووی: بیستم لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو: هەرکەس سورەی( الواقعە) لەهەموو شەوێکدا بخوێنێت هەرگیز تووشی هەژاری و نەبوونی نایەت.

٨٣- عن العرباض بن سارية(رضي الله عنه) ان النبي(ﷺ) كان يقرا المسبحات قبل ان يرقد ويقول:( ان فيهن آية خير من الف آية)

واتە: لە عرباض کوڕی ساریەوە(ﷺ) دەگێڕنەوە کەپێغەمبەر(ﷺ) پێش ئەوەی ڕابکشێت بۆ پشوودان و خەوتن( المسبحات)ی دەخوێند، دەیفەرموو: ئایەتێکیان تیایە لەهەزار ئایەت خێرترە.

( المسبحات) بریتییە لە پێنج سورەت(( الحدید، الحشر، الصف، الجمعة والتغابن)) واپێدەچێت ئەو ئایەتەبێت: ﴿لَوْ أَنزَلْنَا هَذَا الْقُرْآنَ عَلَى جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُ خَاشِعاً مُّتَصَدِّعاً مِّنْ خَشْيَةِ اللَّهِ﴾ (الحشر/٢١) واتە: ئەگەر ئەو قورئانەمان لەسەر شاخێك دابەزاندایە ئەوا دەتبینی بەترسەوە و مل کەچ و لەرزۆك دەهاڕدرا لەترسی خوا.

٨٤- عن معقل بن یسار(ﷺ) عن النَبي( ﷺ) قال: ((من قال حین یصبح ثلاث مرات اعوذ بالله السمیع العلیم من الشیطان الرجیم وقرأ ثلاث آیات من اخر سورة الحشر وکلَّ به سبعین الف ملك یصلّون علیه حتی یمسي وان مات في ذلك الیوم مات شهیدا ومن قال حین یمسي کان بتلك المنزلة)). ( رواه الترمذي)

واتە: پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەس لەبەرەبەیاندا سێ جار وتی:( پەنا دەگرم بەخوای بیسەری زانا لەشەیتانی ڕەجم کراو)و سێ ئایەتی کۆتایی سورەتی (الحشر) بخوێنێت ﴿ هو الله الذي لااله..... ﴾ حەفتاهەزار فریشتەی بۆ دەکرێتە پشتیوان و دروودی لەسەر دەدەن و داوای ڕەحمەتی بۆدەکەن تا ئێوارە، وەئەگەر مرد لەوڕۆژەدا بەشەهیدی دەمرێت، وەئەگەر ئێوارە وتی هەمان پلەی هەیە.

شـهید لـهم فـهرموودهدا مهبهسـت لـهو پلـهی شـههادهته نییـه کهفـهرموودهکانی تـری پێغهمبـهر(ﷺ) ئاماژهیـان پێکـردووه کهلـهپێناوی بهرزکردنهوهی ئالاّی پیرۆزی ئیسلامدا جهنگاوه دژ بـه کـافران و بێبـاوهڕان. کهسانی تریش ههن کهپلهی شههیدی لهجۆری یهکهمیان دهست دهکـهوێت، کهسێك بهئاو بخنکێت یان کهسێك بهدوای زانستدا بگهڕێت ئهوهش شـههیده، کهسـێك لـهپێناوی بـهرگری لـهخاك و ئـاو و ناموسـیدا بجـهنگێت و بمرێـت شههیده، بهلاّم ئهوانه ناگهنه پلهی قورئان خوێنهکه.

٨٥- عن أبي هريرة(ﷺ) ان رسـول الله( ﷺ) قـال: ((مـن القـرآن ثلاثون آية شفعت لرجل حتى غفر له وهي تبـارك الـذي بيـده الملـك)). ( رواه أبوداؤد والترمذي وقال حديث حسن)

واته: لهقورئاندا سی ئایهت ههیه شهفاعهت و تکایان بۆ کهسێك کـرد تابهخشرا و خوا لێی خۆش بوو ئهویش سورهی( الملك)ه: ﴿ تبارك الذي بيده الملك﴾ . پێشهوا (ترمزی) ڕیوایهتی کردووه لهئبن عهباسهوه(ﷺ) فـهرمووی: ههنـدێك لـههاوهڵانی پێغهمبـهر(ﷺ) خێمهکـهیان لهسـهر گۆڕێـك ههڵـدا نهیاندهزانی کهکهسی تیایه قورئان دهخوێنێت( تبـارك الـذي) تاتـهواوی کـرد. دواتر هاوهڵهکه گهڕایـهوه لای پێغهمبـهر(ﷺ) وتـی: ئـهی پێغهمبـهری خـوا، خێمهکـهم لهسـهر گۆڕێـك ههڵـدا نـهمزانی گۆڕهکـه کهسـێکی تیـابوو سورهی( تبارك)ی خوێند تاتهواوی کرد. پێغهمبهری خوا(ﷺ) فهرمووی: ئهوه قهڵغانه و ئهوه ڕزگارکهره لهسزای گۆڕ. سـزای گـۆڕ بـهپێی قورئـانی پـیرۆز سابت و جێگیره وحهقیقهته:﴿ النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُـدُوّاً وَعَشِـيّاً وَيَـوْمَ تَقُـومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ﴾ (الغافر/٤٦) واتـه: ئـاگری دۆزهخـه،

بەیانیان و ئێواران، نیشانیان دەدرێت، یاخود پیایاندا دەچزێنرێت لـە( جیهـانی بەرزەخدا) ڕۆژی قیامەتیش فەرمان دەدرێت: ئادەی تاقم و دەسـتەی فیرعـەون بخەنە نـاو ئـێش و ئـازاری زۆر ناخۆشـەوە. سـورەی( ملـك) شـەفاعەت بـۆ هاوەڵەکەی دەکات، ئەوکەسەی زۆر دەیخوێنێتـەوە و لەخزمەتیدایـە لەسـزای ئاگر ڕزگاری دەکات.

٨٦- عن عائشة(ﷺ) قالت: كان النبي( ﷺ) لاينام حتى يقرأ الزمـر وبـني اسـرائيل. ( رواه الترمـذي) واتـە: لەعائیشـەوە(ﷺ) فـەرمووی: پێغەمبەر( ﷺ) نەدەخەوت تا سورەی ( الزمـر) و بـني اسـرائيل واتـة سـورةتي ( البقرة)) نەخوێنێتەوە.

٨٧- ((من قرأ والتين والزيتون فانتهى الى آخرهـا فليقـل بلـى وانـا على ذلك من الشاهدين ومن قرأ لااقسم بيوم القيامة فانتهى الى آخرهـا الـيس ذلك بقادر على ان يحي الموتى فليقل بلى ومن قرأ والمرسلات فبلغ فبأي حديث بعـده يؤمنـون، فليقـل آمنـا بـالله)). (رواه أبـوداؤد والترمـذي) واتـە: هەرکەس( والتين والزيتون)ی خوێند و گەیشتەکۆتاییەکەی بابڵێت( بلـى وانـا علـى ذلـك مـن الشـاهدين) وهەرکـەس( لااقسـم بيـوم القيامـة)یخوێنـدو گەیشـتە﴿ الـيس ذلـك بقـادر علـى ان يحـي المـوتى﴾ بابڵێـت ( بلـى) وهەرکەس( والمرسلات)ی خوێند و گەیشتە﴿ فبـاي حـديث بعـده يؤمنـون﴾ بابڵێت( امنا بالله) بەوشێوەیە پێویستە لەسـەر کەسـی قورئـان خـوێن کـەبیر و هۆشی ئامادەبێت.

* ئەگەر بەئایەتی ڕەحمەتدا تێپەڕی داوای ڕەحمەتی خوا بکات.

* ئەگەر بەئایەتی سزادا تێپەڕی داوابکات خوا بەدووری بکات لێی.

* ئەگەر بەئایەتی پرسیاردا تێپەڕی وەکو ئەوەی باسمان کرد بلێ( بلی).

* ئەگەر بەئایەتی سوجدەدا تێپەڕی سوجدە و کڕنووش ببات.

* ئەگەر بەئایەتی دوعادا تێپەڕی دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزبکاتەوە بۆ نزاکردن و پاڕانەوە وەئەگەر نزاکە بۆ لادانی ناخۆشی و موسیبەتێك بوو لەپی دەستی بۆ خوارەوە وەربگێڕێت. هەموو ئەوانە لەپێغەمبەرەوە(ﷺ) هاتووە.

٨٨- عن أنس(رضي الله عنه) عن النبي( ﷺ) قال: من قرأ اذا زلزلت عدلت له بنصف القرآن ومن قرأ قل يا ايها الكافرون عدلت له بربع القرآن ومن قرأ قل هوالله احد عدلت له بثلث القرآن. ( رواه الترمذي) واته: لە ئەنەسەوە(رضي الله عنه) لەپێغەمبەری دەگێڕێتەوە فەرموویەتی: هەرکەس( اذا زلزلت)ی خوێندەوە بەڕادەی نیوەی قورئانە بۆی وەهەرکەس ( قل ياايها الكافرون)ی خوێند بەڕادەی چارەکی قورئانە بۆی وەهەرکەس( قل هوالله احد)ی خوێند بەسێ یەکی قورئان دەچێت بۆی.

هاوتا بوون بەبەشێك لە قورئان لەسەر بنچینەی ئەو بابەتانەیە کەسورەتەکە لەخۆی گرتووە لە مژدەدان و ترساندن و ئاگادارکردنەوە. سورەی( زلزلة) ئاگادارکردنەوە و ترساندنی کافران و بێباوەڕانی تیایە بۆ ڕۆژی دوایی کەڕۆژێکی ترسناکە و تەرازووی کردەوەکانی تیا دەخرێتەکار. کە ئاماژەی ئەوەی تیا دەخوێنرێتەوە باسی قیامەت نیوەیە و باسەکەی تری باسی ژیانی دونیایە. هەروەها( کافرون) باسی بەرائەت و خۆبەری کردنە

لەکافر و بێباوەڕان. سورەی( الاخلاص) باسی عەقیدە و بیروباوەڕی یەکتا ناسی و یەکتاپەرستییە. لەفەرموودەی تردا هاتووە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لەهاوەلان(ﷺ) کردووە کەکێ دەتوانێت لەڕۆژێکدا قورئان خەتم بکات؟ عەرزیان کرد: کێ دەوانێت؟ فەرمووی: ناتوانن سێ جار( قل هوالله احد) بخوێنن؟ عەرزیان کرد: بەڵێ. فەرمووی: ( قل هوالله احد) سێ یەکی قورئانە، هەرکەس سێ جار بیخوێنێت وەکو خەتمێکی قورئانی کردبێت وایە. بەتایبەتی ئەمە بۆ ئەوکەسانەیە کە کەم خوێنەوارن.

٨٩- عن عائیشة(ﷺ) قالت: قال رسول الله( ﷺ): ((من قرأ بعد صلاة الجمعة قل هوالله احد وقل اعوذ برب الفلق وقل اعوذ برب الناس سبع مرات اعاذه الله من السوء الى الجمعة الاخرى)). ( رواه ابن السني- حديث صحيح) .

واتە: لە عائیشەوە(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرموویەتی: هەرکەس دوای نوێژی هەینی حەوت جار( قل هوالله احد) و( قل اعوذ برب الفلق) و(قل اعوذ برب الناس) بخوێنێت خوا لەهەر خراپە و ناخۆشییەك تا هەینی داهاتوو دەیپارێزێت. نوێژی هەینی هەفتەی جارێکە و نوێژێکی تایبەتە بەخێر و فەڕ و بەرەکەتێکی زۆر، تەواوی ئەوەش بە کۆتایی هێنانیەتی بە نزا و پاڕانەوە و قورئان خوێندن و یادی خوا. ئەو سورەتانە باسی لەتاك و تەنهایی خوا و نزا و پاڕانەوە و پەناگرتن بەخوا لەهەر شەڕ و ئاژاوە و ناخۆشییەك و بەهیوای بەردەوام بوونی تا هەینی داهاتوو. باوەڕدار وەکو بازرگانێکی کارامە و چالاك وایە هیچ هەل وکات و بۆنەیەك و هۆکارێك لەدەست خۆی نادات

بۆ دەستخستنی قازانج. که لەهەوڵدایه بۆئەوەی خێرێکی زیاتر وبەرەکات و فەری زیاتر بۆ قیامەتی خۆی مسۆگەر بکات.

٩٠- بعث النبي( ﷺ) رجلاً على سرية فكان يقرأ لاصحابه في صلاتهم فيختم بقل هوالله احد فلما رجعوا ذكروا ذلك للنبي( ﷺ) فقال: سلوه لاي شيء يصنع ذلك. فسألوه فقال: لانها صفة الرحمن فانا احب ان اقرا بها. فقال رسول الله( ﷺ): ((اخبروه ان الله يحبه)). ( رواه مسلم)

واته: پێغەمبەر(ﷺ) پیاوێکی کردە پێشەوا و ئەمیری سریەیەك ئەویش لەنوێژەکاندا دوای سورەتی فاتحه هەر ئایەتێکی بخوێنایه بە( قل هوالله احد) کۆتایی پێدەهێنا کاتێك گەڕانەوە ئەوەیان بۆ پێغەمبەر باسکرد، ئەویش فەرمووی: پرسیاری لێ بکەن بۆچی وای کردووە؟ پرسیاریان لێ کرد، وتی: چونکه ئەوە سیفەتی خوای میهرەبانه من حەزدەکەم بیخوێنم. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: هەواڵی بدەنێ که خوا ئەوی خۆش دەوێت. ئەو فەرموودەیه ئاماژە بەرادەی تێگەیشتنی قوڵی هاوەڵانی پێغەمبەر(ﷺ) دەکات بۆ قورئانی پیرۆز و شەریعەتی پاکی ئیسلام. زۆر خوێندنەوەی ئەو هاوەڵە بەڕێزە لەهەموو ڕکاتێکدا بۆ سورەی( الاخلاص) ( قل هوالله احد ) کارێکی تازە وداهێنراو بوو نه پێغەمبەر و نەیارانی تر کارێکی وایان نەکردبوو! بیدعه بوو! بەڵام بیدعە و داهێنراوێکی چاك بوو نەك تەنها لەبەرئەوەی کەپێغەمبەر ئیقراری کرد بەڵکو چونکه لەگەڵ ڕۆحی ئەم ئاینه پاکەدا یەکدەگرێتەوە لەبەگەورە زانینی خوا و خۆشەویستی و خۆشویستنی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز که تعظیمی سیفاتەکانی خوای گەورە دەکەن. ئیقرارەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ کاری ئەو هاوەڵە بەڕێزە دەیکاته سوننەت.

٩١- عن عقبة بن عامر(رضي الله عنه) ان رسول الله(ﷺ) قال: الم تـر آيـات انزلت هذه الليلة لم ير مثلهن قط (( قل اعـوذ بـرب الفلـق وقـل اعـوذ بـرب الناس)) . ( رواه مسلم)

واته: لـه عەقەبەی کـوڕی عـامرەوە(رضي الله عنه) کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویەتی: ئایا نەتبینی ئایـەتانێك ئەمشـەو دابـەزیوە، هاوشـێوەیان نـەبینراوە هەرگیز(( قل اعوذ برب الفلق وقل اعـوذ بـرب النـاس))ە . بێگومـان هـەموو ئایەتێك یان کۆمەڵە ئایەتێك لـە قورئاندا هاوشـێوەیان نییـە، ئـەو دوو سـورەتە سورەتی ئیستیعازە و پەناگرتنە بەخوای گەورە، وە دوعا و نزا و پاڕانەوەیە، نە لەناو قورئاندا نە لـەناو عەرەبدا هاوشێوەیان نییە.

٩٢- عن عبدالله بن عباس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله( ﷺ): اسم الله الاعظم الذي اذا دعي به اجاب في هذه الآية: قل اللهم مالك الملك تؤتي الملك من تشاء وتنزع الملك ممن تشاء وتعز من تشاء وتذل من تشاء بيدك الخير انـك على كل شيء قدير. ( رواه الطبراني)

واته: لـه عەبدوڵڵای کوڕی عەباسەوە(رضي الله عنه) فەرمووی: پێغەمبـەر(ﷺ) فەرموویەتی: ناوی هەرە گـەورەی خـوا کەئەگـەر پێـی بـانگ بکرێـت وەڵام دەداتـەوە لـەم ئایەتەدایـە: خوایـە تـۆ خـاوەنی هـەموو شـتێکیت، دەسـەڵات دەبەخشیت بەهەرکەسێك بتەوێت و دەسەڵات وەردەگریتـەوە لـەهەرکەسـێك بتەوێت. هەرکەس بتەوێت بالادەستی دەکەیت، هەرکەسێکیش بتەوێت زەلیـل و بێدەسەلات و ژێردەستی دەکەیت. هەرچی خێـر هەیـە هەربەدەسـتی تۆیـە، بێگومـان تـۆ دەسـەڵاتداریت بەسـەر هـەموو شـتێکدا.

خـوای گـەورە نـەوەد و نـۆ نـاوی هەیـە هەرکـەس لەبـەری بکـات دەچـێتە بەهەشتەوە. لەبەرکردنی بریتییە لەدەرخستنیان و کارپێکردنیـان و ئەنجامـدانی ئەوەی کە فەرمانی پێدەکەن. خـوای گـەورە لەناویانـدا نـاوی هەرەگـەورە و مەزنی خۆی شاردۆتەوە و نادیارە. ئەم فەرموودەیە و چەندین فـەرموودەی تـر ئامـاژە بەهەنـدێك ئایـەت دەكـەن كـەناوی هەرەگـەورەی خـوای گـەورە لەوشوێنانەدایە، لەقورئانی پیرۆزدایە.



## دەروازەی نۆیەم
### کرێ وەرگرتن لەسەر قورئان خوێندن و دوعا کردن پێی

٩٣- عن جابر بن عبدالله(رضي الله عنه) قال: دخل رسول الله(ﷺ) فاذا قوم يقرأون القرآن قال: ((اقرأوا القرآن وابتغوا به الله عز وجل من قبل ان يأتي قوم يقيمونه اقامة القدح يتعجّلونه ويتأجلونه)). ( رواه الامام احمد وابوداؤد)

واتە: لەجابری کوڕی عەبدوڵڵاوە(رضي الله عنه) فەرمووی: پێغەمبەری خوا هاتە ژوورەوە کەسانێك قورئانیان دەخوێند، فەرمووی: قورئان بخوێنن، مەبەستتان پێی خوای گەورەبێت پێش ئەوەی گەلێك بێت کە بەکاری بهێنن وەکو پەرداخێکی ئاو یان کەبۆ خواردنەوەی هەرشتێك بەکاردێت، پەلەیانە لێی و دوای ناخەن. لێکچوواندنی قورئان خوێندنی ئەو( قەوم)ە بەپەرداخێك کە بۆ تێرکردنی شەهوەت و ئارەزوواتی خۆی و دەستخستنی ماڵ و سامان یان شوهرەت و ناوبانگ....

٩٤- عن عمران بن حصين(رضي الله عنه) انه مر على قاصّ يقرأ ثم سأل فاسترجع ثم قال: سمعت رسول الله(ﷺ) يقول: من قرأ القرآن فليسأل الله به فانه سيجيء اقوام يقرأون القرآن يسألون به الناس. ( رواه الترمذي وحسنه)

واتە: لە عیمرانی کوڕی حصینەوە دەگێڕنەوە کەتێپەڕیوە بەلای چیرۆکخوانێکدا، قورئانی دەخوێند پاشان داوای دەکرد( دیارە ئەوکەسە

مەبەستی پارە پەیداکردن بووە بەقورئان خوێندنەکەی) عیمران گەڕایەوە بۆلای و فەرمووی: من لە پێغەمبەری خوام(ﷺ) بیستووە کەدەیفەرموو: هەرکەسێك قورئانی خوێند باتەنها داوای لەخوا پێبکات کەسانێك دێن قورئان دەخوێنن داوای لەخەڵکی پێدەکەن( واتە بەکرێ دەیخوێنن) .

لەقورئانی پیرۆزدا نەهی کراوە لەوەی کەئەم قورئانە بۆ مەبەستی دنیایی و بژێوی ژیان بەکاربهێنرێت و قورئان خوێن دەست لەخەڵکی پان بکاتەوە، چونکە قورئان بۆئەوە نەهاتۆتە خوارەوە بەڵکو بۆ ڕێنومایی و هیدایەتدانی خەڵك هاتووە ڕەحمەت و نوور وڕووناکییە پێویستە مسوڵمان تەنها داوا لەخوا بکات و مەبەستی بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خوا بێت.

مەبەست لە ( استرجاع) ( انا لله وانا الیه راجعون) وتنە واتە: عیمران ئەوەی بە موصیبەت زانی کەبینی کەسێك قورئان دەخوێنێت بەمەبەستی دەستخستنی پارە و پول، کەچەند زۆرن ئەوانە لەئەمڕۆدا.

٩٥- عن أبي سعيد(ﷺ) قال: كنا في مسير لنا فنزلنا فجاءت جارية فقالت ابن سيد الحي سليم فهل معكم راق؟ فقام معها رجل فرقاه بام القران فذكر للنبي( ﷺ) فقال: وما يدريه انها رقية؟ ( رواه البخاري)

واتە: لەئەبی سەعیدی خودریەوە(ﷺ) فەرمووی: لەکاروانییەکدا دەڕۆیشتین لەشوێنێك دابەزین کەنیزەکێك هات ووتی: کوڕی گەورەی هۆز نەخۆشە ( مار پێوەی دابوو) ئایا کەسێکتان لەگەڵدا هەیە چارەسەر و نزایەکی لابێت؟ پیاوێك لەگەڵیدا هەستا وچارەسەری کرد بە( ام القری) واتە سورەی فاتیحە وچاك بووەوە. ئەوەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرد، فەرمووی: ئەو بەچیدا

دەزانێت ئەوە( رقيە) و چارەسەرە؟ تەواوکەری فەرموودەکە لەریوایەتێکی تردا بەم شێوەیەیە: کاروانەکە داوایان لەئاواییەکە کردووە کەمیوانداریان بکات، رازی نەبوون کەمیوانداریان بکەن، بەلام کەداوایان لێکردن نزایەك بۆ مارانگازێکیان بکەن. هاوەڵە بەڕێزەکەش داوای کرێ و بەرامبەرێکی کرد لەپاداشتی ئەوکارەدا. دوای چاك بوونەوەی نەخۆشەکە کرێی خۆی وەرگرت لەمەڕومالات. کاتێك ئەوەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرد، فەرمووی:(واضربوا لي منها بسم) واتە: پشکێکم بدەنێ لێی کە پێشکەش بە هاوەڵەکە کرابوو. ئەوە خودی قورئانەکە نییە چارەسەر و شیفا بدات بەڵکو تەنها خوای گەورەیە کەشیفا بەخش و چارەدۆزە و هەمووشت بەدەستی خۆیەتی﴿وَلَوْ أَنَّ قُرْآناً سُيِّرَتْ بِهِ الْجِبَالُ أَوْ قُطِّعَتْ بِهِ الأَرْضُ أَوْ كُلِّمَ بِهِ الْمَوْتَى بَل لِّلّهِ الأَمْرُ جَمِيعاً﴾ (الرعد/٣١) واتە: ئەگەر قورئانێك بێت، شاخەکانی پێ بجولێنرێت و زەوی پێ ببڕدرێت یان قسەی لەگەڵ مردوودا پێ بکرێت. بەڵکو هەموو کارێك تەنها بۆ خوایە. ئایا ئەوانەی باوەڕدار بوون بێ هیوانەبوون کەئەگەر خوا بیویستایە هیدایەتی هەموو خەڵکی دەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا کەخوای گەورە لەناو قورئاندا هەندێك نهێنی و فەڕ و بەرەکاتی حەشارداوە ئەگەر هەرکام لەوانە یەکانگیربێت لەگەڵ کاتی دیاریکراودا و لەلایەن کەسانێکی باوەڕدارەوە بخوێنرێت نەخۆشە چاك دەبێتەوە وشیفای بۆدێت﴿وَنُنَزِّلُ مِنَ الْقُرْآنِ مَا هُوَ شِفَاء وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلاَ يَزِيدُ الظَّالِمِينَ إَلاَّ خَسَاراً﴾ (الاسراء/٨٢) واتە: دادەبەزێنین لەقورئان ئەوەی کەدەبێتە شیفا و ڕەحمەت بۆ باوەڕداران ستەمکاران جگە لە زیانمەندی هیچ زیادناکەن.

( رقية) چارەسەرێکی دەروونیـە سوود و قازانجی بەئـەزموون سـەلماوە زانایانی دەروونناسی و پزیشکەکان جەختیان لـەسەرکردۆتەوە کاریگەری تـەنها بـۆ دەرد و نەخۆشـییە دەروونییـەکان نییـە بـەڵکو بـۆ نەخۆشـییە جەسـتەیی وئەندامییەکانیشە کە هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بـۆ هۆکـاری دەروونـی وەکـو ترس و هاوشێوەکانی کە پێویستی بە دڵئـارامی نـەخۆش هەیـە، دەبێتـە هـۆی لادانی دوودڵی و تێکچوونی باری دەروونی.

**٩٦ – عن عبدالله بن عباس(رضي الله عنه) قال: قال رسول الله(ﷺ): ان احق ما اخذتم عليه اجراً كتاب الله. ( رواه البخاري)**

واتە: لە عەبـدوڵڵای کـوڕی عەباسـەوە(رضي الله عنه) فـەرمووی: پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) فەرموویـەتی: ئـەوەی کەشایسـتەبێت کرێـی لەسـەر وەربگـرن کتێبەکـەی خوایـە. ئـەبو لـەیثـی سـەمەرقەندی لـەکتێبی( بسـتان العـارفین) وتوویەتی: فێرکردن سێ جۆرە:

١ – بۆ( حسبة) بەومانایەی بەهیوای پاداشتی خوایی.

٢ – بەرامبەر بەکرێیەك.

٣ – بێ مەرج، ئەگەر دیارییەکی پێشکەش بکرێت وەریدەگرێت.

یەکەمیان پاداشتی هەیـە، ئـەوە کـاری پێغەمبەرانـە( سـڵاوی خوایـان لێبێت). دووەمیان ڕای جیـاوازی لەسـەرە هـاوەڵانی پێشـینمان فەرموویانـە: دروسـت نییـە کـرێ وەرگـرتن لەبەرامبـەر فێرکـردن، لەبەرئـەوەی کەپێغەمبەر(ﷺ) فەرموویـەتی:(( بلغـوا عـني ولـو ايـة)) واتـە: لـەجیاتی مـن

بیگەیەنن ئەگەر یەك ئایەتیش بێت. کۆمەڵێکی تر لـەزانایانی دوایـی وتوویانـە دروستە وە وتوویانە باشترە بـۆ مامۆسـتا و فێرکـار کـرێ بەمـەرجی بگرێـت بۆلەبەرکردن و فێرکردنی نووسین، ئەگەر مەرجی دانا بـۆ فێرکردنـی قورئـان هیواخوازم هیچی تیانەبێت، چونکە مسوڵمانان ئەوەیان بۆ ماوەتەوە پێویسـتیان پێیەتی. بەڵام سێهەم دروستە لای هەمووان، چونکە پێغەمبـەر(ﷺ) مامۆسـتای مرۆڤایەتی بووە و دیاری وەرگرتووە فەرموودەی باسی مارانگازەکە ڕۆشنە کە سورەی فاتیحەیان بەسەردا خوێند و چـاك بـووەوە و دیاریانـدا بەهاوەڵەکـە و پێغەمبەریش(ﷺ) کەبیستی فـەرمووی:(( واضـربوا لـي معکـم فیهـا بسـهم)) پشکیان بۆدانا بەڵکو ئەمەش تەواوکەری فەرموودەکەی پێشـتر بێـت کەباسـی مارانگازەکە بوو، بەڵام دوعا و نزاکردن بکرێت بە پیشـە و کاسـبی و لافیتـە هەڵواسین ئەوەیە کەپێغەمبەری خوا(ﷺ) قەدەغەی کردووە لەفـەرموودەکانی ژمارە( ٩٣ و ٩٤).

٩٧- عن عائشة( ﵂) قالت: کان النبي(ﷺ) اذا اشتکی یقرأ علی نفسه بالمعوذتین وینفث فلما اشتد وجعه کنت اقـرأ علیـه وامسـح بیـده رجـاء برکتها. ( رواه الثلاثة)

واتە: لە عائیشەوە(﵂) فەرموویەتی: پێغەمبەر(ﷺ) ئەگەر ئـازارێکی هەبوایە هەردوو سورەی(معوذتین)ی بەسـەر خۆیدا دەخوێند و فـووی دەکـرد، کاتێك ئازارەکەی زیادی بکردایە من بەسـەریدا دەمخوێنـد مەسـحم بەدەسـتی دەکرد بەهیوای فەڕ و بەرەکەت. لەم فەرموودەدا بەڵگەی ئەوە هەیـە کـەزۆر پێویستیمان بە ڕقیە و نزاکردن هەیە. ئەگـەر پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـەهیوای شیفای خوایی بێت لەمیانەی خوێندنی هەردوو سورەتی( قل اعوذ بـرب الفلـق

وقل اعوذ برب الناس) ئەوا مسولڵمانانی تر زۆر زیاتر موحتاجن بەو نزاکردنە. ئەوەتا عائیشە نزا و قورئان بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ) دەخوێنێت کەسەرداری هەموو مرۆڤایەتییە، بەوەش هیواخوازە هەندێك لە پیرۆزی پێغەمبەری بەربکەوێت بەمەسح کردنی دەستە پیرۆزەکانی.

٩٨- عن أبي بن كعب(ﷺ) قال: كنت عند النبي(ﷺ) فجاء اعرابي فقال: يا نبي الله ان لي أخاً وبه وجع، قال: وما وجعه؟ به لمم، قال(ﷺ) فأتني به فوضعه بين يديه فعوذه النبي(ﷺ):

١- الفاتحة(بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ *الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ* الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ*مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ* إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ*اهدِنَــــا الصِّرَاطَ المُستَقِيمَ*صِرَاطَ الَّذِينَ أَنعَمتَ عَلَيهِمْ غَيرِ المَغضُوبِ عَلَيهِمْ وَلاَ الضَّالِّينَ) الفاتحة/١-٧.

٢- اربع آيات من اول سورة البقرة.﴿ الم *ذَلِكَ الْكِتَابُ لاَ رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ *الَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِالْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ الصَّلاةَ وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ * والَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِالآخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ﴾ البقرة/١-٤.

٣- والهكم اله واحد+ اية الكرسي. ﴿وَإِلَـهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ﴾البقرة/١٦٣ ﴿ اللّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ لاَ تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلاَ نَوْمٌ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلاَ يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلاَّ بِمَا شَاء وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ وَلاَ يَؤُودُهُ حِفْظُهُمَا وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ﴾ البقرة/٢٥٥

٤- وثلاث ايات من اخر سورة البقرة. ﴿لِّلّهِ ما فِي السَّمَاوات وَمَا فِي الأَرْضِ وَإِن تُبْدُواْ مَا فِي أَنفُسِكُمْ أَوْ تُخْفُوهُ يُحَاسِبْكُم بِهِ اللّهُ فَيَغْفِرُ لِمَن يَشَاءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ *آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ* لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْساً إِلاَّ وُسْعَهَا لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ رَبَّنَا لاَ تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ أَخْطَأْنَا رَبَّنَا وَلاَ تَحْمِلْ عَلَيْنَا إِصْراً كَمَا حَمَلْتَهُ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِنَا رَبَّنَا وَلاَ تُحَمِّلْنَا مَا لاَ طَاقَةَ لَنَا بِهِ وَاعْفُ عَنَّا وَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا أَنتَ مَوْلاَنَا فَانصُرْنَا عَلَى الْقَوْمِ الْكَافِرِينَ﴾ البقرة/٢٨٤-٢٨٦.

٥- واية من آل عمران﴿شَهِدَ اللّهُ أَنَّهُ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ وَالْمَلاَئِكَةُ وَأُوْلُواْ الْعِلْمِ قَآئِمَاً بِالْقِسْطِ لاَ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾آل عمران/١٨.

٦- وآية من سورة الاعراف ﴿إِنَّ رَبَّكُمُ اللّهُ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ اسْتَوَى عَلَى الْعَرْشِ يُغْشِي اللَّيْلَ النَّهَارَ يَطْلُبُهُ حَثِيثاً وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومَ مُسَخَّرَاتٍ بِأَمْرِهِ أَلاَ لَهُ الْخَلْقُ وَالأَمْرُ تَبَارَكَ اللّهُ رَبُّ الْعَالَمِينَ ﴾الأعراف/٥٤

٧- وآخر سورة المؤمنين ﴿فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ* وَمَن يَدْعُ مَعَ اللَّهِ إِلَهاً آخَرَ لَا بُرْهَانَ لَهُ بِهِ فَإِنَّمَا حِسَابُهُ عِندَ رَبِّهِ إِنَّهُ لَا يُفْلِحُ الْكَافِرُونَ* وَقُل رَّبِّ اغْفِرْ وَارْحَمْ وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴾المؤمنون/١١٦-١١٨.

٨-واية من سورة الجن:﴿ وَأَنَّـهُ تَعَـالَى جَـدُّ رَبِّنَـا مَـا اتَّخَـذَ صَـاحِبَةً وَلَـا وَلَداً ﴾الجن٣.

٩-وعشر آيات من اول سورة الصافات﴿وَالصَّـافَّاتِ صَـفّاً *الزَّاجِـرَاتِ زَجْراً *فَالتَّالِيَاتِ ذِكْراً* إِنَّ إِلَهَكُمْ لَوَاحِدٌ * رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْـأَرْضِ وَمَـا بَيْنَهُمَـا وَرَبُّ الْمَشَارِقِ * إِنَّا زَيَّنَّا السَّمَاءَ الدُّنْيَا بِزِينَةٍ الْكَوَاكِبِ * وَحِفْظاً مِّن كُلِّ شَـيْطَانٍ مَّارِدٍ * لَا يَسَّمَّعُونَ إِلَى الْمَلَإِ الْأَعْلَى وَيُقْذَفُونَ مِـن كُـلِّ جَانِـبٍ * إِلَّـا مَـنْ خَطِـفَ الْخَطْفَةَ فَأَتْبَعَهُ شِهَابٌ ثَاقِبٌ ﴾ الصافات/١-١٠

١٠-وثلاث آيات من سورة الحشر .﴿ هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُـوَ عَـالِمُ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ هُوَ الرَّحْمَنُ الرَّحِيمُ*هُوَ اللَّهُ الَّذِي لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ الْمَلِـكُ الْقُـدُّوسُ السَّلَامُ الْمُؤْمِنُ الْمُهَيْمِنُ الْعَزِيزُ الْجَبَّارُ الْمُتَكَبِّرُ سُبْحَانَ اللَّهِ عَمَّا يُشْرِكُونَ* هُوَ اللَّهُ الْخَالِقُ الْبَارِئُ الْمُصَوِّرُ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَى يُسَبِّحُ لَهُ مَا فِـي السَّـمَاوَاتِ وَالْـأَرْضِ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴾الحشر/٢٢-٢٤

١١-وقل هوالله أحد ومعوذتين. ﴿قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ*اللَّهُ الصَّمَدُ* لَـمْ يَلِـدْ وَلَمْ يُولَدْ* وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُواً أَحَدٌ﴾ الإخلاص/١-٤ .و﴿قُلْ أَعُوذُ بِـرَبِّ الْفَلَـقِ* مِن شَرِّ مَا خَلَقَ* وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ* وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ* وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴾الفلق/١-٥. و ﴿قُلْ أَعُـوذُ بِـرَبِّ النَّـاسِ* مَلِـكِ النَّـاسِ* إِلَـهِ النَّاسِ*مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ * الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ*مِـنَ الْجِنَّـةِ وَ النَّاسِ﴾ الناس/١-٦.

فقام الرجل كانه لم يشك قط. ( اخرجه عبدالله بن احمد في زوائـد المسـند بسند حسن) واته: لە ئوبەی کوڕی کەعبەوە(ﷺ) فەرمووی: لای پێغەمبەر(ﷺ)

بووم ئه‌عرابییه‌ك( ده‌وارنشین) هاته خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)و وتی: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا برایه‌کم هه‌یه ئازارێکی هه‌یه، فه‌رمووی: ئازاره‌که‌ی چییه؟ وتی: جۆرێك له تێکچوونه یان( مَس) کراوه، فه‌رمووی: بیهێنه. هێنایه به‌رده‌ستی و داینا، پێغه‌مبه‌ر(ﷺ) ئه‌م ئایه‌تانه‌ی به‌سه‌ردا خوێند:

١- سوره‌تی فاتیحه.

٢- چوار ئایه‌ت له‌سه‌ره‌تای سوره‌تی( البقرة) .

٣- والهكم اله واحد. الله لااله الا هو الحي القيوم، لاتأخذه سنة ولانوم....تا کۆتایی اية الكرسي.

٤- سێ ئایه‌تی کۆتایی سوره‌تی( البقرة) .

٥- ئایه‌تی ١٨ له‌سوره‌تی( آل عمران) ﴿ شهد الله انه لااله الاهو والملئكة واولوا العلم قائما بالقسط.....﴾ تا کۆتایی ئایه‌ته‌که.

٦- ئایه‌تی( ٥٤) له‌سوره‌تی( الاعراف): ﴿ ان ربكم الله...﴾ تا کۆتایی.

٧- کۆتایی سوره‌تی(المؤمنين)( ١١٦-١١٨): ﴿ فتعالى الله ..﴾ تا کۆتایی.

٨- ئایه‌تێك له‌سوره‌تی( الجن): ﴿ وانه تعالى جد ربنا ما اتخذ صاحبة ولاولدا﴾ ئایه‌تی ژماره/٣ .

٩- ده ئایه‌ت له‌سه‌ره‌تای سوره‌تی( الصافات): ﴿ والصافات صفا، فالزاجرات زجرا، .....الا من خطف الخطفة فاتبعه شهاب ثاقب﴾ .

١٠- سێ ئایەتی کۆتایی سورەتی( الحشر): ﴿ هو الله الذي لااله.....﴾ تا کۆتایی.

١١- سورەتی( قل هوالله احد وقل اعوذ برب الفلق) و(قل اعوذ برب الناس)

پیاوەکە هەستایە سەرپێ وەکو ئەوەی کەپێشتر هیچی نەبووبێت.

ئەو ئایەتانە کە پێغەمبەر(ﷺ) هەڵیبژاردن تایبەتمەندی ئەوەیان هەیە کەخوای گەورە وای داناوە. چارەسەر بەقورئان کارێکی زۆر باشە و پێچەوانە نییە و دژنییە بەبەکارهێنانی چارەسەری پزیشکی، بەڵکو پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیداوە کەبگەرێن بەدوای چارەسەردا: (( ان لكل داء دواء فاذا وقع الدواء على الداء بريء المريض باذن الله)) ( رواه مسلم واحمد) واتە: هەموو نەخۆشییەك دەرمانی خۆی هەیە ئەگەر دەرمانەکە کەوتە سەر دەرد و نەخۆشییەکە ئەوا نەخۆشییەکە چاك دەبێتەوە بەپشتیوانی خوا.

٩٩- عن عائشة( ﵂) قالت: كان النبي(ﷺ) اذا اوى الى فراشه كل ليلة جمع كفيه ثم نفث فيهما فقرأ قل هوالله احد وقل اعوذ برب الفلق وقل اعوذ برب الناس ثم يمسح بهما ما استطاع من جسده يبدأ بهما على رأسه و وجهه وما اقبل من جسده يفعل ذلك ثلاث مرات. ( رواه البخاري)

واتە: لە عائیشەوە( ﵂) فەرمووی: پێغەمبەر( ﷺ) کاتێك دەچووە سەر جێگای خەوتن هەموو شەوێك هەردوو لەپی دەستی کۆدەکردەوە وپاشان فووی دەکرد پیایاندا و سورەتی( قل هوالله احد و، قل اعوذ برب الفلق و، قل اعوذ

برب الناس)ی دەخوێند و مەسحی هەموو جەستەی پێدەکرد چەند دەستی بگەیشتایە، سەرەتا لەسەر و دەم وچاویەوە دەستی پێدەکرد تا ئەوەی دەستی پێدەگەیشت، سێ جار ئەوەی دەکرد. لەفەرموودەیەکی تردا کەریوایەتی پێشەوا ترمزی و ئەبودائود و دارمی لەعروەی کوڕی نەوفل کە لە باوکیەوە گێڕاویەتیەوە کە بەپێغەمبەری وتووە: ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) شتێکم فێربکە بیلێم کاتێك چوومە سەر جێگای خەوتن، فەرمووی:﴿ قُلْ يَا أَيُّهَا الْكَافِرُونَ﴾ بخوێنە بەریبوونە لە شیرك. فوۆکردن بەهەردوو دەستدا و مەسح کردنی هەموو جەستە کینایەیە بۆ کۆکردنەوەی بەرەکاتی نزا و دوعاکە و دابەشکردنیەتی بەسەر لاشەدا. ئەوەش تەنها بۆئەوەیە کەبیر و هۆشی مسولمانان لەکاتی نزاکردندا کۆبێت و بەملا ولادا نەڕوات.

١٠٠ - عن شداد بن اوس(ﷺ) قال: قال رسول الله(ﷺ): ما من مسلم يأخذ مضجعة فيقرأ سورة من كتاب الله تعالى الا وكل الله به ملكاً يحفظه فلا يقربه شيء يؤذيه حتى يهبّ متى هبّ. واتە: لە شەدادی کوڕی ئەوسەوە(ﷺ) فەرمووی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: هەر مسولمانێك جێگای خۆی بگرێت و سورەتێك لەکتێبەکەی خوا دەخوێنێت بێگومان خوای گەورە فریشتەیەك تایبەت دەکات بۆ ئەوەی بیپارێزێت هیچ شتێك لێی نزیك نابێتەوە ئازاری بدات تا هەڵدەستێت هەرکات هەستا بۆهەر ئایەتێك یان سورەتێك یان ووشەیەك بەڵکو بۆ هەموو پیتێك فریشتەی تایبەت هەیە کە لە خزمەت ئەو ئایەت یان سورەت یان ووشەیە هەرکەس بیخوێنێتەوە ئەو فریشتە دادەبەزێتە خوارەوە بۆ ئەوەی هەرکارێك خوا پێی دەسپێرێت بیکات بۆ خوێنەر جا پاراستنی بێت یانەقەدەغەکردنی شەیتانەکان لێی یان دوورخستنەوەی

لەشەڕ یان کوفر یان مژدەی پاراستنی لەئاگر پێدەدەن، مردن لەسەر ئیمـان و باوەڕ ئەگەر خوا مردنی بۆ نووسیبوو. ئـەو تایبەتمەندییـە هەمووکـەس هەسـتی پێناکات، خوای گەورە نهێنییەکانی دادەنێت لای هەرکەس بیـەوێت، چـونکە توانا و زانایە و هەموو شتێك لای خۆیەتی و بۆخۆی دەگەڕێتەوە. هـیچ کـەس جگە لە خـوا ناتوانێـت فـەزڵ و گـەورەیی خوێندنـەوەی سـورەی( الکهـف) لەڕۆژی هەینیدا دەربخات و خوێنەرەکەی لەفیتنەی دەجال پارێزراو بکات، کە پێغەمبەر(ﷺ) لەفەرموودە شیرینەکانیدا باسی لێوە کردووە بەهیواین لەخێر و فەڕ وبەرەکاتی ئەو قورئانە بێبەش نەبین و لەقیامەتدا خـوا ڕەحمـان پێبکـات و کاروباری دونیاشمان بۆ ئیصلاح بکات.... ((رَبَّنَا آتِنَا فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنَا عَذَابَ النَّارِ)) پەروەردگارا لە دونیا چاکە و خێر وخۆشیمان پێ ببەخشە و لەڕۆژی دووایشدا چاکە وخێـر وخۆشـی، وەپارێزراومـان بکـە لەسزای ئاگر ئامین.

و آخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمين ...

لەکۆتاییدا پێویستە بڵێین ئایا کاتی ئەوە نـەهاتووە بـاوەڕداران دڵیـان داچڵەکێت و دڵیان پڕبێت لەخشوع بۆ قورئان و زیکری خوا وەنەچێتە ڕیزی کەسێك کە کتابی ئاسمانیان بۆهـات، بـەڵام فـەرامۆش و پشـتگوێیان خسـت، هەروەك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَلَمْ يَأْنِ لِلَّذِينَ آمَنُوا أَن تَخْشَعَ قُلُوبُهُمْ لِذِكْرِ اللَّهِ وَمَا نَزَلَ مِنَ الْحَقِّ وَلَا يَكُونُوا كَالَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلُ فَطَالَ عَلَيْهِمُ الْأَمَدُ فَقَسَتْ قُلُوبُهُمْ وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ فَاسِقُونَ﴾(الحديد/١٦) .

# پێرست